# وەڵامێك بۆ بەدر خوڕماڵی

لەسەر ئەثەرەکەی اسحاق بن راهوی (کە ابن عبدالبر نقلی دەکات) و بابەتی حکم بغیر ما انزل الله


نووسینی
**عبدالله بتوێنی**



ئامادەکردنی
**دەزگای هیجرەت بۆ ڕاگەیاندن**




# وەڵامێك بۆ بەدر خورماڵی

**لەسەر  ئەثەرەکەی إسحاق بن راهویە  (کە إبن عبدالبر نەقلی دەکات) و بابەتی حکم بغیر ما أنزل الله**

# پێڕست

# بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ باالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

أما بعد...

لەم کتێبەدا بە ئیزنی الله تعالی ڕەدێکی بەهێزی بەدر خورماڵی داستانی دەدەینەوە لەسەر قولەکەی ئیمام إبن عبدالبر کە لە إسحاق بن راهویەوە (رحمهم الله) قولێك نقل دەکات لەسەر بابەتی حکم بغیر ما انزل الله کە بووتە چقڵی چاوی داستانیەکان، کە دەیسەلمێنێت یاسادانان و تەشریع پێچەوانەی شەرعی الله کوفری اکبرە ئەگەر یاسادانەر خۆشی بەتاوانبار بزانێت.

ئیمام إبن عبدالبر (کە لە ساڵی ٣٦٨ کۆچی لەدایك دەبێت و لە ساڵی ٤٦٣ی کۆچی ووفات دەکات)، ئەم ئیمامە بەڕێزە قولێك لە ئیمامی بەڕێز إسحاق بن راهویەوە نقل دەکات (کە لە ساڵی ١٦١ کۆچی لە دایك دەبێت و لە ساڵی ٢٣٨ کۆچی ووفات دەکات)، لەسەر بابەتی حکم بغیر ماانزل الله، کە تیایدا زۆر بە ئاشکراو بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە پەکخستن و دوورخستنەوە و تەرككردنی حوکمێك یان یاسایەك لە یاساکانی الله تعالی کە دایبەزاندووە، کوفری لە دین دەرکەرە ئەگەر اعتقادیشی وابوو کە حوکمی الله حەقە، ئیتر چ حەدێك لە حەدەکان بێت وەکو لابردنی دەستبڕین لە حوکم یان ئەمرێك لە ئەمرەکان وەکو قەدەغەکردنی حیجاب لە وڵات، جا ئەم ئەثەرە پێچەوانەی ئەثەرەکەی إبن عباس نیە (رضي الله عنه) کە دەڵێت کفر دون کفرە، تا بڵێین پێچەوانەی سەلەفی کردووە و ئەثەرەکەی لێ وەرناگیرێت، قسەکەی ئیمام اسحاق بن راهویە لەسەر دوورخستنەوە و پەکخستن و وازهێنانی هەمیشەیی و تەرکی تەواوەتی حوکمێکی الله ـیە کە بە لەفزی سەلەف پێی دەگوترێت (دفع شيء مما أنزل الله) واتە دوورخستنەوەی شتێك کە الله دایبەزاندووە، بە لەفزی ئێستاش پێی دەگوترێت یاسادانان

پێچەوانەی شەرع لەدەستووردا، کە ئەم یاسادانانەش هەمان مانای (دفع شيء مما انزل الله) دەدات، کە حاکمێك پێچەوانەی شەرع یاسا دادەنێت و حوکمی الله دووردەخاتەوە و حوکمی پێ ناکات و لە ئیشی دەخات و پەکیدەخات و دەیگۆڕێت و حوکمێکی دیکە لە باتی ئەوە ئیش پێ دەکات، کە نە ئەثەرەکەی ابن عباس لەسەر ئەمەیە! نە خیلافیش هەیە لە نێوان سەلەف و خەلەف کە دواتر بە تفاصیل باسی دەکەین، کە قسەکەی ئیمام إسحاقیش کە إبن عبدالبر نقلی دەکات .

بەدر خورماڵی بە چەند شوبهەیەکی ئەم ئەثەرە بەدرۆ دەخاتەوە کە لەوانە:-

١-دەڵێت مادەم ئەثەرەکە سەنەدی نیە و ١٣٠ ساڵ لە نێوان إبن عبدالبر و إسحاق بن راهویە هەیە، کەواتە ئەثەرەکە درۆیە، وەکو ئەوەی إبن عبدالبر درۆزن بوبێت و خیانەتی لەم دینە کردبێت.

ئەو کە ئەهلی عیلم شاهیدی بۆ دەدەن کە یەکێك بوە لە تێگەشتوترین کەس کە لە سەلەف و ئاثار و حەدیث تێگەشتبێت پاش سەلەف، کەسێکی تێگەشتووی وەکو إبن عبدالبر کە کەمتر لە سەدەیەکی بەین بووە لەگەڵ سەلەف و لە سەلەف تێنەگەشتبێت و نەیزانیبێت بەڵامی بەدر خورماڵی وداستانیەکان لە سەلەف تێگەشتن و زانیان.

٢- دەڵێت إبن عبدالبر جەهمیەکی پیسە و قسەی لێ وەرناگیرێت، کە ڕەدی ئەم شوبهەیەش دەدەینەوە و بە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر و أقوالەکانی إبن عبدالبر خۆی کە دژی جەهمیەکان کردویەتی بە چەسپاندنی هەموو سیفاتەکانی الله تعالی و وە بەشاهیدی زانایانی دوای خۆی دەیسەلمێنین کە إبن عبدالبر لە ئەهلی سونەیە و زۆر بە توندی ڕەدی جەهمیەکانی داوەتەوە.

٣-شوبهەیەکی دیکەی ئەوەیە کە دەڵێت إبن عبدالبر خۆی بەدرۆ دەخاتەوە بەوەی لە جێیەکی دیکەدا ئەثەرەکەی إبن عباس نقل دەکات گوایە حکم بغير

ما انزل الله ــ ی بەلاوە کوفری اصغرە، جا ڕەدی ئەم شوبهەیەش دەدەینەوە بەوەی کە هیچ کەس ئەم ئەثەرەی ابن عباسی بۆ تشریع و یاسادانان بەکارنەهێناوە بێجگە لە مورجیئە و جەهمیەکانی کۆن و سەردەم لە مەدخەلیەکان و داستانیەکان نەبێت، وە ئەثەرەکەی إبن عباس بە تەئویلە سەقەتەکەی داستانیەکان لەسەر یاسادانان و تشریعە دژی حوکمی الله، نەك تەئویلی صحیحی ئەهلی سونە، کە لای ئەهلی سونە ئەثەرەکەی إبن عباس لەسەر حوکم نەکردنی جارجارە نەوەك یاسادانان پێچەوانەی شەرعی الله، کە ئەم شوبهەیەش ڕەدێکی بەهێزە بۆخۆیان کە ابن عبدالبر و ئەهلی عیلم جیاوازیان لەنێوان حوکم نەکردنی جار جار لەگەڵ دوورخستنەوەی حوکمێکی الله و پەککخستنیدا کردووەبەوەی چۆن دەبێت ابن عبدالبر لە جێیەك بڵێت یاسادانان کوفری أکبرە و لە جێیەکی دیکە بڵێت کوفری أصغرە، چۆن دەبێت ابن عبدالبر خۆی بەدرۆ خستبێتەوە؟، ابن عبدالبر خۆی لە خۆی تێنەگەشت بەڵام بەدر لێی تێگەشت، قسەیەکی بە درۆ دەخاتەوە و قسەیەکی دیکەی وەردەگرێت.

# حكم بغير ما انزل الله چیه و چۆنه؟

پێش ئەوەی بچینە سەر باسەکە دەمەوێت ڕونکردنەوەیك بدەم لەسەر بابەتی حكم بغير ما انزل الله بۆ ئەوەی باسەکە و قولەکەی إسحاق بن راهويەمان لەبەر چاو بێت.

## حكم بغير ما انزل الله چیه و حوکمی حاکم بغير ما انزل الله چۆنه؟

الله تعالى ئەمری پێمان کردوە کە تحاکم بکەین بۆ کتابەکەی وە حوکم بکەین بە شەرعەکەی، وە حوکم بە بێجگە لە کتێبەکەی حەرام کردوە لەسەرمان هەروەکو چۆن ئەمە ڕوونکراوەتەوە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، کە لەو ئایەتانە ئایەتەکانی سورەتی مائیدە، کە چەند ئایەتێکی تێدایە قسە لەسەر حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە دەکات کە لە ناویاندا ئەم ئایەتانە هەن:

- ئەمرمان پێدەکات کە حوکم بکەین بەوەی الله دایبەزاندوە، وأن احكم بينهم بما أنزل الله. ﴿المائدة ٤٩﴾ واتە: حوکم بکە لە نێوانیاندا بەوەی الله دایبەزاندووە.
- ئاگادارمان دەکاتەوە کە حوکم نەبەیبەوە بۆ لای غەیری ئەوەی کە دایبەزاندوە، ولا تتبع أهواءهم. ﴿المائدة ٤٩﴾ واتە: ئەی محمد شوێنی ئارەزووەکانیان مەکەوە (ئارەزووی یەهودیەکان بۆ حوکم کردن بە غەیری کتابی الله).
- ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی تەنازول نەکەین لە هەرشتێك لەم شەریعەتە پاکە، واحذرهم أن يفتنوك عن بعض ما أنزل الله إليك. ﴿المائدة ٤٩﴾ واتە: ئاگاداریان بە (ئەی محمد) نەتترازێنن لە هەندێك لەوەی الله دایبەزاندوە بۆت.
- داواکاری بۆ ئەنجام دانی حوکمی جاهیلیەتی لێمان حەرامکردووە هەروەکو چۆن بە صیغەی إستفهامی إنکاری(پرسیاریی نکۆڵی کردن) پێمان

دەفەرمێت: أفحكم الجاهلية يبغون. ﴿٥٠ المائدة﴾ واتە: ئایا ئەوان داوای حوكمی نەفامی دەكەن؟

- بە دەقی ئایەت پێمان دەفەرمێت کە هیچ کەس باشتر نیە لە حوکم و یاساداناندن بێجگە لە الله تعالى، ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون. ﴿٥٠ المائدة﴾ واتە: ئایا کێ حوکم و بڕیاری لە هی خوا جوان و چاکترە؟ بۆ کەسانێك کە بڕوای تەواویان هەیە.
- بە دەقی ئایەت پێمان دەفەرمێت کە هەرکەسێك حوکم و دادوەری نەکات بەوەی الله تعالى دایبەزاندوە ئا ئەوانە کافر و زاڵم و فاسقن، ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون، الظالمون، الفاسقون. ﴿٤٤،٥٥،٤٧ المائدة﴾ واتە: جا ئەوەی حوکم و دادوەری نەکات بەوەی الله دایبەزاندوە بەڕاستی ئائەوانە کافرن، ستەمکارن، گومڕان.
- بە دەقی ئایەت پێمان دەفەرمێت کە واجبە لەسەرمان حوکم بەوەی الله تعالى بکەین هەرچەندە ئەوانەشی کە حوکمیان هێناوەتەوە کافر بن، وإن حكمت فاحكم بينهم بالقسط. ﴿٤٢ المائدة﴾

واتە: (ئەی محمد)ئەگەر حوکمت کرد لە نێوانیان(لە نێوان کافران) ئەوە بە دادوەری حوکم بکە..

کەواتە حوکم و دادوەری بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندوە هەڵوەشێنەرەوەی ئیمان و تەوحیدە (کە حەقی الله یە بەسەر بەندەکانیەوە کە بە تاکیرابگرن تێیدا)، وە حوکم بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە دەبێتە کوفری أکبر و دەشبێتە کوفری أصغر بە پێی حاڵی حاکمەکە.

دەبێتە کوفری گەورەی دەرکەر لە ئیسلام لەم حاڵەتانەدا:

١- ئەوەی یاسای دارِشت پێچەوانەی شەرعی الله تعالی، وەکو ئەوەی حاکمی وڵاتێك بڵێت لە بەرنامەی کاری ئێمەدا حوکمی دز زیندانیکردنە، یان بڵێت لە وڵاتی ئێمەدا حیجابکردن قەدەغەیە، جا لێرەدا پێی کافر دەبێت ئەگەر خۆشی بە تاوانبار بزانێت و دانیش بنێت بەوەی الله دایبەزاندوە، چونکە یاسادانان حەق و مافی الله تعالی یە و هیچ شەریکێکی نیە تێیدا، جا هەرکەسێك هەر یاسایەکی دارِشت پێچەوانەی شەریعەتەکەی الله، ئەوە موشریکە، الله تعالی دەفەرمێت: أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله. ﴿٢١ الشورى﴾

واتە: **ئاخۆ ئەوانە هاوبەشانێکیان بۆ الله بریار داوە کە یاسایان بۆ دادەرِێژن لە دینێکدا لەوەی کە الله رِێگەی پێ نەداوە؟.**

٢- یان ئەو کەسەی کە جەحد و ئینکاری حوکمێکی الله تعالی دەکات کە دایبەزاندوەتە خوارەوە، جا بەمە کافر دەبێت، هەروەکو چۆن لەرِیوایەتەکەی إبن عباس دا (رضي الله عنه) هاتوە لەسەر ئایەتەکەی الله تعالی: ومن لم يحكم بما انزل الله فأولئك هم الكافرون، کە إبن عباس دەڵێت: من جحد ما انزل الله فقد كفر. واتە: ئەوەی جەحد و نکۆڵی لەوە بکات الله دایبەزاندوە ئەوە کوفری کردووە.

٣- یان حوکمی طاغوت لە حوکمی الله بەباشتر بزانێت، ئیتر یان ئەوەتا ئەم بەباشتر زانینە بە گشتیە، یان تەنها لە یەك حوکمدایە، هەروەکو الله تعالی دەفەرمێت: أفحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون. واتە: ئایا ئەوان داوای حوکمی نەفامی دەکەن؟ ئایا کێ حوکم و برِیاری لە هی الله جوانتر و چاکترە، بۆکەسانێك کە برِوای تەواویان هەیە.

٤- ئەوەی گوتی حوکمی الله و حوکمی طاغوت یەکسانن، الله تعالی دەفەرمێت: فلا تجعلوا لله اندادا وانتم تعلمون. ﴿٢٢ البقرة﴾ واتە: کەواتە هاوتا بۆخواپەیدامەکەن کەئێوە خۆتان دەزانن (بێ هاوتایە).

٥- یان وا بیر بکاتەوە دروستە حوکم بکات بە پێچەوانەی حوکمی الله، یان وابیر بکاتەوە کە حوکم بەوەی الله دایبەزاندووە واجب نیە، وە وابزانێت ئازادە لە حوکمکردندا، ئەمەش کوفرێکی هەڵوەشێنەرەوەی ئیمانە، الله تعالى پێمان دەفەرمێت: یا أيها الرسول لا يحزنك الذين يسارعون في الكفر من الذين قالوا آمنا بأفواههم ولم تؤمن قلوبهم. ﴿٤١ المائدة﴾ واتە: ئەی (پێغەمبەر ﷺ) خەم بارت نەکات ئەوانەی کە پێشبڕکێ دەکەن لەبێ بڕواییدا لەوانەی کە بەدەم دەڵێن باوەڕمان پێت هێناوە بەڵام لە ناو دڵەکانیان باوەڕیان نەهێناوە.

هەتاوەکو ئایەتەکە دەگاتە: إن أوتيتم هذا فخذوه. واتە: ئەگەر ئەمەی (ئێمە) تان پێ گوترا (لەلایەن موحەممەدەوە ﷺ) ئەوە وەری گرن.

ئایەتەکە لەسەر جولەکەکە دابەزی کە زینای کردبوو و لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەرگیری کردبوو، جا کاتێك دەیویست حوکم بەرێتەوە بۆ لای رسول الله عليه صلاة وسلام سەرکردەکانی جولەکە دەیانزانی حوکمەکەی رەجمە، پێان گوت ئەگەر حوکمی بەسەردا دای بە جەڵد یاخود ڕوڕەشکردن ئەوە وەریگرە، بەڵام ئەگەر حوکمی بەسەردای بە رەجم وەری مەگرە، پاشان الله تعالى ئایەتی دابەزاند وفەرمووی: ئەوەی حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندوە ئائەوانە کافرن .

تێبینی: ئەمە ڕەدێکی بەهێزە بۆ موسەنا ئەمینی مورتەد و کافر کە دەڵێت رەجم لە قورئاندا نەهاتوە، هەموو هاوەڵان و تابعیەکان و زانایانی سلف و خلف کۆکن کە ئەو ئایەتە: يقولون إن أوتيتم هذا فخذوه وإن لم تؤتوه فاحذروا، لەسەر رەجم دابەزیوە، وە اجماع هەیە ئەوەی ئینکاری رەجم بکات کافرە بە الله تعالى.

6- ئەوەی حوکم نەکات بەوەی کە الله دایبەزاندوە وەکو بەرهەڵستیەك بۆ گوێڕایەڵی الله یان ئامادەنەبوون و ملکەچنەبوون بۆ ئەو حوکمانەی کە الله دایبەزاندوون، یان پەکخستنی حوکمێك لە حوکمەکانی الله و ئیش پێ نەکردنی بە یەکجارەکی، بە مانایەکی دیکە تەرککردنی تەواوەتی حوکمێکی الله، هەر کەس ئەوەی کرد ئەوە موشریك و کافرە بە الله بە کوفرێکی گەورەی دەرکەر لە دین، کە ئەگەر ئەو حوکمەشی بە درۆ نەخستبێتەوە و جحد و انکاریشی

نەکردبێت هەر کافرە بە الله، وە بەڵگەشمان بۆ ئەمە قولەکەی إسحاق بن راهویە کە إبن عبدالبر نقلی دەکات کە لە خوارەوە باسی دەکەین، کە لای داستانییەکان تا پێش ئەوەی ئەو قولەی إبن عبدالبر ببینن، إبن عبدالبر ئیمامی ئەهلی سونە بوو بەڵام ئێستا جهمیە لەلایان.

جا ئەوەی کە لەسەرەوە باسمان کرد کە حکم بغیر ما انزل الله تیایدا کوفری أکبرە دەتوانین لە چەند خاڵێکدا کورتی بکەینەوە:

١. ئەوەی یاسا دابڕێژێت پێچەوانەی شەرعی الله تعالی.
٢. جحد یان انکاری حوکمی الله بکات.
٣. بە باشتر دانانی حوکمی طاغوت لە حوکمی الله تعالی جا ئەم باشتر زانینە بە گشتی بێت یان بە جزئی.
٤. ئەوەی یەکسانیی کرد لە نێوان حوکمی الله تعالی و حوکمی طاغوتدا.
٥. ئەوەی گوتی حوکمی الله تعالی باشترە لە حوکمی طاغوت، بەڵام حوکم کردنی بە حوکمی طاغوت بە جائیز دانا یان بڵێت حوکم بەوەی الله دایبەزاندوە واجب نیە یان هەڵبژاردن لەدەست خۆیەتی حوکم بکات یان نا.
٦. بەرهەڵستی بۆ گوێڕایەڵی الله و ئامادەنەبوون و ملکەچنەبوون بۆ حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندوە یان پەك خستنی حوکمێکی الله.

جا ئێمە لێرەدا قسە لەسەر خاڵی شەش دەکەین و چەند نمونەیەکی سادەی بۆ دەهێنینەوە پاشان ڕەدی بەدر خورماڵی دەدەینەوە بە ئیزنی الله کە قسەکەی لەسەر خاڵی شەشە

چەند نمونەیەك لە خاڵی شەشەم کە تیایدا حاکم پێی کافر دەبێتەوە (تەنها بە خودی کارەکە) :-

- لابردنی شەریعەتی ئیسلامی لە حوکم کردن و هێنانی چەند یاسایەکی دیکە لە باتی ئەوە، هەروەکو چۆن موستەفا کەمال ئەتاتورکی طاغوتی مەلعون ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلامی لابرد کە لە حوکمەکانی مەزهەبی حەنەفیەوە وەرگیرابوون، لە جێگای ئەم حوکمانەدا کە ئیسلامی بوون، چەند یاسایەکی دەستکردی هێنا، جا هەرکەسێك وەکو موستەفا کەمال ئەتاتورك یاساکانی شەرع دووربخاتەوە و پەکیان بخات لە حوکم پێ کردنیان چەند یاسایەکی دەستکرد بهێنێتە جێگایان کافرە بە الله تعالی طاغوتێکە و دەپەرستریَ، جا ئینکاری حوکمی الله بکات یان نەیکات، دانیپێدابنێت یان نەینێت، مادەم ئامادەنەبوە ملکەچ بێت بۆ ئەمرەکانی الله تعالی و منعی کارپێکردنی کردوون وە خاڵێك لە خاڵەکانی تەوحیدی بەجێنەگەیاندوە کە ئەویش پابەند بوونە بە الله تعالی بە گوێڕایەلی کردنی، ئەوە کافرە بە الله تعالی موشریکە وەکو شەیطان.
- لابردنی مەحکەمە شەرعیەکان.
- پابەند کردنی خەڵکی بەو یاسا دەستکردانەوە، یاخود یاساگەلێك دابنێت تێکەڵ بێت لە یاسا جاهیلیەکان و لەگەڵ یاساکانی ئیسلام، وەکو ئەوەی جەنگیز خان کردی کە بە کۆدەنگی زانایانی سەردەمی خۆی هەرکەسێك وەکو جنگیز خان یاسا دابڕێژێت یان حوکم بەرێتەوە بۆ لای ئەو یاسایانە پێی کافر دەبێتەوە بەبێ دانانی هیچ قەید و مەرجێك بۆ اعتقاد.
- یان کەمکردنەوەی ڕۆڵی مەحکەمە شەرعیەکان و کورت کردنەوەی لە خاڵە مەدەنیەکانی (بە گومانی خۆیان) وەکو نیکاح و تەلاق و میرات.
- دانانی مەحکەمە نا شەرعیەکان.
- خستنە دەنگدانی یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی لە پەرلەمان کە ئەمەش واتای ئەوەیە زۆرینە ڕای چیبوو لەسەر ئەوە بڕیار دەدرێت، کە بەبڕیاردان

بە پێچەوانەی شەریعەت واتای ئەوەیە یاسایەك لە یاساکانی ئیسلام پەکبخرێت و ئیشی پێ نەکرێت و دووربخرێتەوە کە ئەمەش کوفرە بە الله عز وجل، کە ئەگەر لە داستانیەکان بپرسیبن: دوورخستنەوە و پەککخستنی حوکمی ئیسلام کوفرە یان نا؟ دەڵێن ئەگەر خۆی بەتاوانبار زانی کوفری بچوکە، بەڵام کە پرسیاری پەرلەمانییان لێ دەکەین دەڵێن پەرلەمان کوفری أکبرە،

(ئەمە لە کاتێکدایە بەڵێ راستە لە پەرلەمان حوکمی خۆیان لە حوکمی الله بە باشتر دەزانن، بەڵام کە یاسا دادەڕێژن ئەگەر خۆشیان بە تاوانبار بزانن مادام یاسایان پێچەوانەی شەرع داڕشتووە کافرن، جا ئەگەر یاسا داڕێژراوەکانیان کە پێچەوانەی شەرع دایانڕشتوە لە پەرلەمان بە خراپتر لە یاساکانی ناو شەرع زانیبا و شەرعی الله یان بە باشتر زانیبا لەو یاساگەلەی کە دایانڕشتووە و خۆیان بە تاوانبار زانیبا تەنها بەدەم، ئەوە داستانیەکان تکفیریان نەدەکردن و کوفرەکەیان بە کوفری أصغر ناودەبرد نەك أکبر، چونکە لای داستانیەکان یاسا داڕشتن پێچەوانەی شەرع کوفری أصغرە نەك أکبر ئەو کاتە دەبێتە أکبر کە یاساداڕێژەرەکان حوکمەکان خۆیان لە حوکمەکانی الله بەباشتر بزانێت، ئێ ئەوانەی ناو پەرلەمانیش خۆ گوێز ناژمێرن لەوێ، هەر یاسادادەڕێژن پێچەوانەی شەرع کە ئەگەر لەو کارەیاندا خۆیان بە تاوانبار زانیبا ئەوە داستانیەکان تکفیریان نەدەکردن، چونکە داستان محمد لە کتێبەکەیدا زۆر تەئکید لەوە دەکاتەوە کە ئەسڵی یاسادانان کوفر نیە، لەولاشەوە پرسیاری پەرلەمانیان لێ بکە خۆیان و دەمووچاویان گرژ دەکەن و دەڵێن پەرلەمان کوفرە بە هەموو جۆرێك، لە جێیەکی دیکەشدا دەڵێن ئەگەر حاکمێك یاسای داڕشت و خۆی بە تاوانبار زانی پێی کافر نابتەوە، ئێ ئێمەش دەڵێین حاکم بێجگە لە پەرلەمان لە کوێی دیکەدا یاسا دادەڕێژێت؟ کەواتە بەڵێ بە قسەی ناڕاستەوخۆی داستانیەکان بێت ئەو پەرلەمانانەی کە یاسا دادەڕێژن بەڵام خۆیان بە تاوانبار دەزانن کافر نابن! بەڵام لێیان بپرسین پەرلەمانتان پێ چۆنە یەکسەر بێ شك دەڵێن کوفرە وەکو ئەوەی کە پەرلەمان شاخ و گوێی هەبوبێت، کەوتونەتە ناو گێژاوێکەوە هەتا مردن تیایدا دەتلێنەوە و نەك چیتر خەڵك شوێنیان ناکەوێت بگرە ناتوانن خۆشیان لەو گێژاوە دەرباز بکەن)

کەواتە تکفیری داستانیەکان بۆ خواکانی ناو پەرلەمان تەنها لەسەر ئەوەیە کە بە دەم ئینکاری و جحدی ئایەتەکانی الله تعالی دەکەن نەك لەبەر پەك خستن و داڕشتنی یاساو قانون پێچەوانەی شەرع و خۆ کردنە خوا بەسەر خەڵکەوە

- دانانی شەریعەت بە سەرچاوەی ناسەرەکی یان تەنانەت سەرچاوەی سەرەکیش لەگەڵ سەرچاوە جاهیلیەکانی دیکە هەموو ئەمانە کوفرن بە الله تعالی وەلەو جحد و ئینکاری حوکمی الله ش نەکەن وەلەو حوکمی الله ش بە فەرز بزانن وەلەو حوکمی الله ش بەباشتر بزانن.

## بەڵام کەی حکم بغیر ما انزل الله دەبێتە کوفری أصغری دەرنەکەر لە ئیسلام؟

لە وەڵامدا ئەو حاکم و قاضیەی کە حوکمی بە غەیری حوکمی الله تعالی کردووە کوفرەکەی دەبێتە کوفری بچوك ئەوکاتەی کە لە قەزیەیەکدا حوکمی نەکرد بەوەی الله دایبەزاندوە بەهۆی هەوا و شەهوەتەوە یان معصیەتێکەوە یان بەهۆی خۆشەویستی بۆ کەسێکی نزیکی یان لە پێناو ڕەشوەیەك یان لە پێناو ئەو شتانەی لە دەوری ئەمانەدان لەگەڵ إعتقادی بەوەی کە حوکمی الله تعالی واجب و حەقە و خۆی زۆر بە تاوانباردەزانێت وە ئەوەی کردویەتی حەرامە و لە کبائرەکانە، ئەوە پێی کافر نابێتەوە و کوفرەکەی کوفری أصغرە و ئەمەش هەر ئەوەیە کە إبن عباس باسی دەکات.

بەڵام بە نسبەت حوکم بردنەوەشەوە بۆ لای حوکمە جاهیلیەکان هەر کەس حوکم بەرێتەوە بۆ لای ئەم یاسا دەستکردانە کافرە بە الله تعالی بەکوفرێکی أکبری دەرکەر لە دین، ئیلا مەگەر لە حاڵەتی إکراه و زۆرلێکردندا نەبێت.

پرسیارا!

- جیاوازی چیە لە نێوان حوکم نەکردنی جار جار و حوکم نەکردنی تەواوەتی؟
- یان بە جۆرێکی دیکە بپرسم لە کوێی ئیسلامدا هاتوە شتێك بە ئەنجام نەدانی جار جارە پێی کافر نەبیت بەڵام بە ئەنجام نەدان و تەرکی تەواوەتی پێی کافر ببیت؟

لە وەڵامدا

جیاوازی لە نێوان حوکم نەکردنی جار جار و حوکم نەکردنی تەواوەتی زۆرە،

جا نەك هەر لە حوکمدا لە ژیانی ڕۆژانەشماندا هەرشتێك کە الله تعالی ئەمری پێ کردووین و معلوم من الدين بالضرورە، هەرکەسێك خۆی منع کرد لە إطاعەی ئەو ئەمرەی الله تعالی، ئەوە کافرە بە الله، بۆ نمونە ئەوەی زینا دەکات پێی کافر نابێتەوە، بەڵام هەر کەسێك گوتی من ئامادە نیم إطاعە و گوێڕایەڵی الله بکەم لە تەرککردن و وازهێنان لە زینا و هەر زینا دەکەم و ئەمری الله تعالی جێبەجێ ناکەم (وەکو ملکەچنەبوون باسی جحد و ئینکاری ناکەین، کە ئەوەی ئینکاری بکات کافرە ئیتر چ تاوانەکە بکات یان نەیکات) ئەگەر خۆشی بەتاوانبار بزانێت هەر پێی کافر دەبێتەوە، چونکە هەروەکو زانایان لە مانای ئیسلام دەفەرموون: ئیسلام بریتیە لە تەسلیم بوون بە الله بە تەوحیدەوە و پابەند بوونە پێوەی بە گوێڕایەڵی کردنیەوە، جا ئەگەر یەکێك ئامادە نەبێت إنقیادی الله تعالی بکات بە إطاعة و گوێڕایەڵی کردنی لە هەر ئەمرێکیدا ئەوە کافرە بە الله با جحد و انکاری ئەمرەکانی الله ـیشی نەکردبێت، کە ئەمەش پێی دەگوترێت کوفری إباء کە بە مانای گوێنەدان دێت، وەکو هەمان کوفرەکەی ئیبلیس کە ئامادە نەبوو إطاعەی الله بکات کاتێك ئەمری پێکر سوجدە ببات بۆ ئادەم.

بەڵگەشمان بۆ ئەمە:-

I. لە معقلی کوڕی عبیداللە ی العبسیەوە، کەوا پیاوێك بە ناوی سالم الافطس بە ئیرجائەوە دەرکەوت، وە معقل چووە مەدینە بۆ لای نافع (کە لە ساڵی ١١٧ ی کۆچی وەفات دەکات و کوڕەزای ئیمامی عومەرە رضی الله عنهم) باسی حاڵەتەکە بۆ نافع دەکات و دەڵێت : بە نافعم گوت : ئەوان (مورجیئەکان) دەڵێن: "نحن نقر بأن الصلاة فريضة ولا نصلي ، وأن الخمر حرام ونحن نشربها ، وأن نكاح الأمهات حرام ونحن نفعل ؛ قال : فنتر يده من يدي ثم قال : من فعل هذا فهو كافر. "

واتە: ئێمە دان بە واجبوونی نوێژدا دەنێین بەڵام نایکەین، وە دان بە حەرامبوونی عارەقدا دەنێین بەڵام هەر دەیخۆینەوە، وە دان بە حەرامی نیکاحکردن لەگەڵ دایکانماندا دەنێین بەڵام هەر دەیکەین، پاشان نافع گوتی: **هەرکەسێك ئەوەی کرد ئەوە ئەو کەسە کافرە.**

السنة لعبدالله بن أحمد : ٣٨٢/١ ؛ الإبانة لابن بطة : ٨٠٩/٢ ؛ شرح أصول الاعتقاد للالكائي : ١/ ٩٥٣

II. وە إبن القیم دەڵێت : وأما كفر الإباء والاستكبار، فنحو كفر إبليس، فإنه لم يجحد أمر الله ولا قابله بالإنكار، وإنما تلقاه بالإباء والاستكبار، ومن هذا كفر من عرف صدق الرسول وأنه جاء بالحق من عند الله ولم ينقد له إباء واستكبارا وهو الغالب على كفر أعداء الرسل.

واتە: بەڵام کوفری گوێنەدان و خۆبەگەورە زانین، وەکو کوفرەکەی ئیبلیس، ئەو جەحدی ئەمری اللە ی نەکرد وە ئینکاریشی نەکرد، بەڵام کوفرەکەی گوێنەدان و خۆبەگەورە زانین بوو، **وە لەم کوفرەش ئەوەی باوەڕی بە ڕاستی ڕسول هەیە کە بە حەقەوە لەلایەن اللەوە هاتووە بەڵام گوێڕایەڵی نابێت وەکو گوێنەدانێك و خۆ بەگەورە زانینێك**، وە ئەم کوفرەش بەربڵاو بووە لە ناو دوژمنەکانی ڕسول اللە علیە صلاة وسلام.

(مدارج السالکین)(1/346)

به ئیزنی الله دەڵێم:-

ابن القیم إنقیاد و گوێڕایەڵ نەبوونی بە ئەمرەکانی اللەوە بەبێ جەحدیش بە کوفر ناوبرد، واتە ئەوەی باوەڕی بە حەق و ڕاستی و دروستی ئەمرەکانی الله هەبێت و جەحدیان نەکات، بەڵام ئامادە نەبێت گوێڕایەڵیان بکات بەهەمان ئەو جۆرەی کە شەیتان گوێڕایەڵی ئەمرێکی اللەی نەکرد ئەوە کافر دەبێتەوە بە الله تعالی، جا بە هەمان شێوە ئەگەر حاکم باوەڕی بە ڕاست و دروستی حوکمەکان و ئەمرەکانی الله تعالی هەبێت بەڵام ئامادە نەبێت تطبیقی ئەم حوکم و ئەمرانە بکات و شتی تر لە باتی ئەو حوکم و ئەمرانە دابڕێژێت ئەوە کافرە بە جۆری کوفری إباء و گوێنەدان، **چونکە سروشتی یاسادانان و دەستور وایە کە حاکمێك کاتێ حوکم یان ئەمرێك لە حوکمکردندا لابرد و یاسایەکی دیکەی لە جێگای ئەوەدا دانا، ئەمە مانای ئەوەیە کە یاسا لابراوەکە بە هیچ جۆرێك تطبیق ناکرێت و بە تەواوی پشتگوێ دەخرێت لەو کاتەوەی کە بڕیار بۆ لابردنی یاساکە دەرچووە وە لە باتی ئەمە یاسا نوێکە بەکار دەبێت و یاسا نوێکە شوێنی یاسا کۆنەکە دەگرێتەوە بە هەمیشەیی،** جا کاتێك حوکمێکی الله تعالی لادەبرێت و یاسایەکی تازە لە باتی ئەو حوکمە دادەنرێت، ئەمەش واتە پابەند نەبوون بە اللەوە بە هەمان ئەو جۆرەی کە إبن القیم باسی دەکات.

پێچەوانەی داستانییەکان کە دەڵێن ئەگەر حاکمێك إنقیادی الله نەکات بەوەی ئەمرەکانی پەك بخات و تطبیقیان نەکات و یاسای پێچەوانەی ئەویش دابڕێژێت مادام جەحد و ئینکاری نەکردووە پێی کافر نابێت، بە هێنانەوەی ئەثەرەکەی إبن عباس و إجماعی سەلەف کە دەڵێن حوکم نەکردن بە قورئان کفر دون کفرە، ئیتر بێ وردبوونەوە ئایا مەبەست لە کام حوکم نەکردنەیە، حوکم نەکردنی جار جار یان حوکمنەکردنی ناو دەستوور وەکو پابەند نەبوونێك بۆ الله کە بە کوفر زانراوە.

تێبینی:- تەرککردنی گوێڕایەڵی الله لە ئەمرەکانیدا کوفرە بەڵام ئەنجامدانی کبائرەکان کوفر نیە، وە ئەوەی گوێڕایەڵی الله نەکات و پابەندی ئەمرەکانی نەبێت وە قۆڵ لە ئەنجامدانی کبائرەکان هەڵبکات و ئامادە نەبێت إنقیادی ئەمرەکانی الله بکات لە تەرککردنی کبائرەکان ئەمە کوفری کردوە.

جا ئەو دوو قەولەی سەرێ بۆ تاك وابوو، چجای بگات بە حاكم كە ئەمرێك یان حوكمێكی الله تعالی پەك بخات و لە ئیشكردنی بخات و إنقیادی الله نەكات لەو ئەمرەیدا، نەك إنقیادی اللەی نەكردووە بە إطاعة كردنی بگرە داواش لە خەڵكی دەكات نەك داوا، بگرە خەڵكیش پابەنددەكات بە یاسا دەستكردەكەیەوە بە گوێڕایەڵی كردنی ئەو یاسایەی كە دایڕشتوە پێچەوانەی شەرعی الله، جا چ ئەقڵێك كافربوونی ئەم طاغوت و خوایە كە إدعای خوایەتی دەكات ڕەت دەكاتەوە بەبیانوی خۆ بە تاوانبار زانینی؟

كەس ئەمە ڕەت ناكاتەوە مەگەر گەمژەیەكی نەفام نەبێت كە ڕاست و چەپی خۆی نەزانێت و هیچ شتێك لە ئایەتەكانی الله تعالی و أحادیثی رسولەكەی صلى الله عليه وسلم و إجماعی زانایان تێنەگەشتبێت.

بەڵێ ئەمەیە جیاوازی لە نێوان حوكم نەكردنی جار جار لەگەڵ یاسادانان و حوكم نەكردنی تەواوەتی و تەركی كوللی إطاعەی ئەمرێكی الله .

# قولەکەی اسحاق بن راهویە کە ابن عبدالبر نقلی دەکات

ئیمام إسحاق بن راهویە (کە لە ساڵی ٢٣٨ی کۆچی وەفات دەکات) یەکێك بوە لە ئیمامە زۆر بەڕێزەکان کە لە تابعیە بەڕێزەکان بووە، قولێکی هەیە کە إبن عبدالبر نقلی دەکات (کە ئەویش لە ٣٦٨ی کۆچی لەدایك دەبێت و ٤٦٣ی کۆچی وەفات دەکات).

## دەقی قەولەکە

*إبن عبدالبر* لە جوزئی ٤ی تمهید لەلاپەرە ٢٢٦ دەڵێت:- وقد قال الإمام *إسحاق بن راهوية* رحمه الله:- "أجمع المسلمون على أن من سب الله ورسوله صلى الله عليه وسلم، أو دفع شيئا مما أنزل الله عز وجل، أو قتل نبيا من أنبياء الله عز وجل أنه كافر بذلك، وإن كان مقرا بكل ما أنزل الله".

واتە: ئیمام *ئیسحاق بن راهویە* رحمە الله دەڵێت: موسوڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی هەرکەسێك جنێوێك بە الله و رسولەکەی صلى الله عليه وسلم بدات، **یان شتێك لەوەی الله دایبەزاندووە دوور بخاتەوە**، یان پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی الله بکوژێت **ئەوە کافرە سەرەڕای ئەوەی دان بنێت بە ڕاستی هەمووو ئەوەی الله دایبەزاندوە**.

دەڵێم: کەسێك بەناوی بەدر خورماڵیەوە هاتووە ڕەدی ئیمامی زۆر بەڕێز إبن عبدالبر دەداتەوە و بە ئاشکرا دەڵێت ئەم ڕیوایەتە درۆیە بە ناوی إسحاق بن راهویەوە کراوە و دیارە إبن عبدالبریشی بەلاوە درۆزن و کذابە.

جا بە ئیزنی الله تعالى لەم کتێبەدا ڕەدی دانە بە دانەی ئەو شوبهە گڵاوانەی کە بەدر خورماڵی لە نامیلکەیەکدا نوسیویەتی دەدەینەوە و بە وردی دەیسەلمێنین کە تشریع و یاسادانان کوفرە بە ئیزنی الله تعالى.

# شوبهەی یەکەم

## ئایا إبن عبدالبر جەهمیە؟

ئەم داستانیە هەر لەسەرەتاوە بەبێ ئەدەبی و بێ ئیحترامی بە ئەهلی عیلم دەستپێدەکات و هەر وەکو چۆن سەرەتا بە ئەوپەڕی بێ ڕێزیەوە دەستیان پێکرد، و بە بوختان کردن بۆ ئیمامی بەڕێز إبن عبدالبر دەست پێدەکات و دەمشڕیەکەی لە ئاستێکدایە مەگەر ڕافیزە موشریکەکان بەوشێوازە ئەدەبە قسە بە ئەهلی عیلم و ئەهلی سونە و أصحاب بڵێن، هەر لە سەرەتای نامیلکەکەیەوە لە لاپەڕە ٤دا دەڵێت: (جارێ ابن عبدالبر جەهمیەکی پیسە، ئەهلی ئەوە نیە هەر ئەسڵەن وەلامی قسەی ئەو بدەینەوە)

دەڵێم: ئەوە ئسلوب و حورمەتەکەیەتی بەرامبەر ئەهلی عیلم، وە خۆی هێناوەتە ئاستی ئیمامی زۆر بەڕێز إبن عبدالبر کە زانایانی پاش خۆی هەموویان وەسف و شاهیدی ڕاستگۆیی و دەستپاکی بۆ دەدەن کە إن شاءالله هەر لەم کتێبەدا شاهیدی زانایان لەسەر ڕاستگۆیی و دانایی إبن عبدالبر نقل دەکەین، بە جۆرێك قسە دەکات کە گوایە ئەم زۆر لە إبن عبدالبر زاناترە و مووی سەری سپی کردووە لە فێربوونی عیلم، جابەم فیز و تکبر و خۆ بە گەورەزانینەیاندا بزانن چ کذابێك و چ دججالێکن.

## ئایا ئەم داستانیە ڕاست دەکات کە ابن عبدالبر جەهمیە؟

با جیاوازیەکانی عەقیدەی جەهمی لەگەڵ ابن عبدالبر دابنێین و بیسەلمێنین کە ئەم داستانیە هەر لە گیرفانی خۆیەوە تۆمەت و بوختان بەئەهلی عیلم دەبەخشێتەوە،

### جیاوازیەکان:

- جەهمیەکان هەموو سیفاتەکانی الله تعالی نەفی دەکەن، وە هەمووی دەکەن بە تاکە سیفەتێك کە ئەویش سیفەتی (هەبوونی ڕەهاییە)، جا با بزانین إبن عبدالبر لەسەر أسماء و صیفاتەکانی الله تعالی چی دەڵێت،

إبن عبد البر دەڵێت: " أهل السنة مجمعون على الإقرار بالصفات الواردة في الكتاب والسنة وحملها على الحقيقة لا على المجاز، إلا أنهم لم يكيفوا شيئا من ذلك"

واتە: ئەهلی سونە ئیجماعیان هەیە لەسەر دان نان بەو سیفاتانەی الله تعالی کە لە قورئان و سونەتەوە هاتوون وە هەڵگرتنیان لەسەر حەقیقەت نەك لەسەر مجازی(خوازراو) لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان هیچ شتێك لەمەیان بە پێی مێشکی خۆیان نەگونجاندوە.

"التمهيد" (١٤٥/٧)

وە لە هەمان سەرچاوە دەڵێت: وأما أهل البدع والجهمية والمعتزلة كلها والخوارج، فكلهم ينكرها، ولا يحمل شيئا منها على الحقيقة، ويزعمون أن من أقر بها مشبه.

واتە: بەڵام ئەهلی بیدەع و **جەهمی** و موعتەزیلە هەموویان و خەواریجیش، هەموویان ئینکاری ئەم صیفاتانە دەکەن، وە هیچ کامیان لەسەر حەقیقەت وەرناگرن، وە واش دەزانن ئەوەی دانی بەم صیفاتانەدا نا ئەوە مشبەیە (جەهمی و موعتەزیلە و ئەشعەری بە ئەهلی سونە دەڵێن مشبە، چونکە وابیر دەکەنەوە کە ئەهلی سونە الله تعالی بە دروستکراوەکانی دەشوبهێنن).

وە دەڵێت:"ونهى السلف رحمهم الله عن الجدال في الله جل ثناؤه في صفاته وأسمائه، لأن الله عز وجل لا يوصف عند أهل السنة والجماعة إلا بما وصف به نفسه أو وصفه به رسول الله صلى الله عليه وسلم أو أجمعت الأمة عليه."

واته: سەلەف ڕەحمەتی الله یان لێبێت نەهیان لە قسەکردن لە الله کردووە لە سیفاتەکانی و ناوەکانی، لەبەرئەوەی الله عزوجل وەسف ناکرێت لای ئەهلی سونەو جەماعە ئیلا بەو شتە نەبێت کە خۆی وەسفی خۆیی پێ کردووە یان ڕسولەکەی صلی الله علیه وسلم وەسفی پێکردووە یانسەلەف ئیجماعیان لەسەری هەبوبێت.

جامع البيان العلم وفضله(2/92)

- جەهمیەکان ئینکاری هەبوونی دەموچاوی الله دەکەن و دەڵێن الله لە دروستکراوەکانی ناچێت کەواتە دەموچاوی نیە وە ئینکاری بینینی الله تعالی دەکەن لە بەهەشتدا.

بەڵام دوبارە إبن عبدالبر دەڵێت: "جعل الله عز وجل الرؤية لأوليائه يوم القيامة ومنعها من أعدائه".

واته: الله تعالی بینینی زاتی خۆی بۆ ئەولیاکانی خۆی(پیاوچاکان) لە ڕۆژی قیامەت داناوە، وە ڕێگری بینینی خۆیشی لە دوژمنەکانیکردوە(کافران). "التمهيد" لە (١٥٤/٧)

گوتم: إبن عبدالبر کە دەڵێت الله تعالی دەبینرێت لە ڕۆژی قیامەت ئەمە واتای ئەوەیە کە دەمووچاوی بۆ الله چەسپاندوە پێچەوانەی جهمیەکان.

- جەهمیەکان ئینکاری پێکەنینی الله تعالی دەکەن دەڵێن الله تعالی هیچ شتێکی لە مرۆڤ ناچێت ئیتر چۆن پێبکەنێت؟

بەڵام إبن عبدالبر دەڵێت "وقد بلغني عن ابن القاسم أنه لم ير بأسا برواية الحديث "أن الله ضحك"، وذلك لأن الضحك من الله...."

واتە: لە ابن القاسمەوە پێم گەشتووە کە هیچ کێشەیەك نیە لە ڕیوایەتی ئەو حەدیسە کە دەفەرمێت "الله تعالی پێدەکەنێت"، وە لەبەر ئەوە پێکەنین لە الله وە بوونی هەیە.... ابن عبدالبر پاشان چەند سیفەتێکی دیکە بۆ الله دەسەلمێنێت. "التمهید" لە (١٥٢/٧)

- جەهمیەکان ئینکاری دابەزینی الله تعالی دەکەن بۆ ئاسمان

بەڵام إبن عبدالبر دووبارە دەڵێت: "کلهم یقول: ینزل ویتجلی ویجيء بلا کیف، لا یقولون کیف یجيء وکیف یتجلی وکیف ینزل، ولا من أین جاء ولا من أین تجلی ولا من أین ینزل، لأنه لیس کشيء من خلقه".

واتە: هەموویان(سلف) دەڵێن: دادەبەزێت و خۆی دەردەخات و دێت بەبێ ئەوەی باسی چۆنیەتیەکەی بکەن، ناڵێن چۆن دێت و چۆن خۆیدەردەخات وە چۆن دێتە خوارێ، وە لە کوێشەوە دێت وە لە کوێشەوە خۆی دەردەخات وە لە کوێشەوە دادەبەزێت، چونکە وەکو هیچ شتێك لەدروستکراوەکانی نیە.

"التمهید" (١٥٣/٧)

- جەهمیەکان ئینکاری لەوە دەکەن کە الله تعالی بەرزبوەتەوە بەسەر عەرشدا و دەڵێن الله تعالی لە سەر عەرش نیە

بەڵام إبن عبدالبر دوبارە دەڵێت: "وفیه دلیل علی أن الله عز وجل في السماء علی العرش من فوق سبع سماوات، کماقالت الجماعة، وهو من حجتهم علی المعتزلة والجهمیة في قولهم: إن الله عز وجل في کل مکــان، ولیس علی العرش. والدلیل علی صحة ماقالوه أهل الحق في ذلك قول الله عز وجل: الرحمن علی العرش استوی ﴿طه:٥﴾ وقوله عز وجل: ثم استوی علی العرش ما لکم من دونه من ولي ولا شفیع ﴿السجدة:٤﴾ وقوله: ثم استوی إلی السماء وهي دخان ﴿فصلت:١١﴾، وذکر آیات کثیرة دالة علی العلو".

واتە: وە لەمەشدا بەڵگە هەیە لە الله عز وجل لە ئاسمانە لەسەر عەرشە لە سەرووی هەر حەوت ئاسمانەکەوە، هەروەکو چۆن ئەهلی سونە وجەماعەت وا دەڵێن، وە ئەمەش لە بەڵگەکانیانە دژی موعتەزیلە و **جەهمیەکان** لەوەی کە دەڵێن: الله عز وجل لە هەموو جێگایەکە، لەسەر عەرش نیە. وە دەلیلیش لەسەر ئەوەی کە ئەهلی حەق گوتویانە لەم بابەتەدا ئایەتەکەی الله عز وجلە کە دەفەرمێت: الرحمن على العرش استوى ﴿طه:٥﴾ وە ثم استوى على العرش ما لكم من دونه من ولي ولا شفيع ﴿السجدة:٤﴾ وە ثم استوى إلى السماء وهي دخان ﴿فصلت:١١﴾.

"التمهيد" (١٢٩/٧)

- جەهمیەکان دەڵێن قورئان مخلوقە بەڵام إبن عبدالبر لە جامع بيان العلم وفضله (١١-١٠/١) دا دەڵێت قورئان کەلامی الله یە.
- جهمیەکان عمل بە بەشێك لە ئیمان نازانن، ئیمان لەلایان تەنها باوەڕ بوونە بە الله بە قول و لەلایان ئیمان کەم و زیاد ناکات، ئیمانی ئیبلیس فیرعەون لەلایان وەکو ئیمانی مەلائیکەت وایە.

بەڵام ئیمامی إبن عبدالبر لەسەر ئیمان دەڵێت: "أجمع أهل الفقه والحديث على أن الإيمان قول وعمل، ولا عمل إلا بنية، والإيمان عندهم يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية، والطاعات كلها عندهم إيمان"

واتە: ئەهلی فیقهو حەدیس کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئیمان قول و عملە، وە عملیش بوونی نیە ئیلا بە نیەت نەبێت، وە ئیمان لەلایان زیاد دەکات بە تاعەتی الله و کەم دەکات بە ئەنجامدانی تاوان، وە طاعەتەکانیش هەمووی لەلایان لە ئیمانە.

"التمهيد" لە (٢٣٨/٩)

ئەوەندە دەلیل و بەڵگە زۆرن لە إبن عبدالبرەوە کە إثباتی ناو و سیفاتەکانی اللە تعالی دەکات دانە بە دانە ئەگەر هەموویان دابنێین کتێبەکەمان زۆر دورودرێژ دەبێتەوە.

کەواتە ئەم زانا بەڕێزە بەشێکی زۆر باشی لە کتابی التمهید داناوە بۆ ڕەددانەوەی جەهمی وموعتەزیلەکان کە تعطیلی ناو و سیفاتەکانی اللە عز وجل دەکەن، جا التمهید ٢٦ دانە مجلەدە کە دایاننێیت لەسەر زەوی لە باڵای بەدر خوڕمالی درێژترن ئەمیش تازە بە تازە دوو نامیلکەی خوێندوەتەوە هاتوە ڕەدی ئیمامێکی زۆر بەڕێز دەداتەوە بە ئەوپەڕی بێ ڕێزیەوە بەو ئیمامە بەڕێزە دەڵێت جەهمی.

جا بە کورتی هەر بۆ زیاتر دڵنیاتر کردنەوەتان لەسەر ئەوەی ابن عبدالبر جەهمی نیە ئەمەی خوارەوە عقیدەی جەهمیەکانە:-

- جەهمیەکان هەموو سیفاتەکانی الە تعالی نەفی دەکەن، وە هەمووی دەکەن بە تاکە سیفەتێك کە ئەویش سیفەتی هەبوونی ڕەهاییە.
- وە ناوەکانی اللە تعالی لەسەر مانا ئەسڵیەکەی خۆی نەفی دەکەن و لایدەبەن.
- وە ئیمان لەلای جەهمیەکان تەنها ناسینی اللە تعالی یە بە دڵ.
- وە جەهمیەکان لە بابەتی قەزا و قەدەر وەکو جەبریەکان وان، کە دەڵێن مرۆڤ ناچارکراوە لەسەر هەموو شتێك و هیچ شتێك بەهەڵبژاردنی خۆی ناکات.
- وە لە بابەتی غەیبدا هەموو ئەو شتانە نەفی دەکەن کە عەقڵ قبوڵی ناکات.

- وە لە قیامەتدا ئینکاری بەردەوام بوونی بەهەشت و جەهەننەم دەکەن، کە وابیر دەکەنەوە بەردەوامی دان بە جەهەننەم لەلایەن الله وە زوڵمەلە بەندەکانی.

جا داواکارم لە هەموو ئەو کەسانەی کە ئەم کتێبە دەخوێننەوە وە تەحەدای بەدریش دەکەم، کە یەك قول و قسەی ئیمامی بەڕێز ابن عبدالبرمان بۆ بهێنێتەوە کە لە جهمیەکان چوبێت یان ڕایەکی وەکو جەهمیەکان بوبێت.

جا بۆیە درێژەمان دا بەوەی کە إبن عبدالبر بەهیچ شێوەیەك نە پەیوەندی بە جەهمیەتەوە هەیە نە بۆنی جەهمیەتیشی لێ دێت، تەنانەت بەتوندیش ڕەتی جەهمیە کافرەکان دەداتەوە، کە بزانن ئەم داستانیانە لەوانەش بەدر خورماڵی چەنێك درۆزن و کذاب و چەواشەکارن، وچەنێك خۆویستن، ئەوەی لەگەڵ خۆیان نەبێت بە کافر و زندیق و جەهمی دەزانن، جا تەحەدایان دەکەین یەك بەڵگەمان بۆبهێننەوە لەسەر کافربوونی إبن عبدالبر کە پێی دەڵێن جهمی جهمیش لە ئومەتی محمد نین و فیرقەیەکی کافرن.

# شوبهەی دووەمی بەدر

بەدر خورماڵی دەڵێت جیاوازی ١٣٠ ساڵ هەیە لە نێوان وەفاتی ئیمام إسحاق بن راهویە و لەدایکبوونی ئیمام إبن عبدالبر، بەدر داوای سەنەد دەکات و دەڵێت بەبێ سەنەد قسە قبوڵ ناکەم وە دەڵێت إبن عبدالبر بە ئیلهام و خەو ئەم قسەیەی لە اسحاق بن راهویەوە وەرگرت کە ١٣٠ ساڵیان لە نێواندایە؟

لە وەڵامماندا بۆ ئەم شوبهە باطلە بە ئیزنی الله دەڵێین، ئەم داستانیانە زۆر زۆر لێزانترن لە مەدخەلیەکان لە چەواشەکردنی بابەتەکانیان، مەدخەلیەکان تا مەودایەك لەگەڵ دێن و چەواشە دەکەن دوایی کە پێیان نەما خۆیان دەدزنەوە و بە سەرشۆڕی مەیدانەکە چۆڵ دەکەن، بەڵام ئەم داستانیانە زۆر لە مەدخەلیەکان شارەزاترن لە چەواشەکردنی بابەتەکان، بەدر خورماڵی دەڵێت من بەبێ سەنەد قسە لە إبن عبدالبرەوە وەرناگرم، ئەمە مانای ئەوەیە کە "کێ ناڵێت إبن عبدالبر درۆی نەکردوە بە دەمی إسحاق بن راهویەوە "وە ئەمەش ڕێك بە مانای بە درۆ خستنەوەی إبن عبدالبرە، یانی إبن عبدالبر درۆزنە مادەم سەنەدی نەهێناوەتەوە کەواتە درۆی بەدەم اسحاق بن راهویەوە کردوە.

جا لە وەڵامی ئەم داستانیەدا دەڵێین:

ئەگەر بڕیار بێت ابن عبدالبر ڕاستگۆو دەم پاك و دەست پاك بێت و لە ئەهلی سونە بێت ئەوە دەبێ سیقەی ئەوەشی پێ بکرێت کە قسەیەك لە کەسێکەوە نقل بکات کە سەدە و نیوێك پێش خۆی ژیابێت، یانی ئەگەر کەسەکە دەستپاك و ئەهلی سونە و شاهیدی پیاو چاکی لەسەر بوو ئەوە هەرگیز ئامادە نیە خیانەت لە زانایانی پێش خۆی بکات و قسە بەدەمیانەوە ببەستێت درۆبە دەمیانەوە بکات و خیانەت لە دینی الله بکات.

ئەوەی ئێستا جێگەی پرسیارە لای خوێنەر ئەوەیە کە:-

ئایا ابن عبدالبر هەر بەڕاستی لە ئەهلی سونە بوە؟

ئایا دەستپاك و دەم پاك بووە؟

ئایا زانایانی دوای خۆی ڕایان چیە لەسەر ابن عبدالبر؟

جا پێش ئەوەی بچینە سەر سەلماندنی دەستپاکی و دەمپاکی و موسوڵمانیەتی إبن عبدالبر حەزدەکەم نیفاقێکی دیکەی ئەم داستانیە کذابانەتان بۆ دەربخەم، بەدر خورماڵی کە ئەگەر داستان محمد نەبێت دەرویشێکی زۆر سەرسەختی داستان محمدە، با بزانین شێخەکەی داستان محمد چۆن قسەی زانایەك نقل دەکات کە قولەکەی إبن عباس باس دەکات کە لە اسنادی قولەکەدا ڕاویەکی ضعیفی تێدایە، بەڵام داستان محمد دەڵێت مادەم ئەم زانایە دەستپاك و دەمپاك و لەخواترس بووە و قولەکەی إبن عباس نقل دەکات با راویەکی ضعیفیشی تێدابێت کەواتە سەرەڕای ضعیفی ڕاویەکە قولەکەمان هەر قبوڵە و گرنگ نیە بەلامانەوە کە ڕاوی ضعیفی تێدابێت.

داستان محمد لە لاپەڕە ٨٢ ی کتێبی حکم بغیر ما انزل الله دەڵێت:

"احمد بن حنبل دەڵێ:

حدثنا سفییان بن عیینة عن هشام بن حجیر عن طاووس ووتی: ابن عباس وتی: ئەو کوفرە نیە کە ئێوە بۆی دەچن.

ئیمام ئەحمد دەڵێ: سوفییان وتی: واتە کوفرێك نیە لە دین دەرخەر بێت (ومن لم یحکم بما انزل الله فأولئك هم الکافرون)"

داستان پاش نقل کردنی ئەم قولەی امام احمد دەڵێت: "ووتم: بڕوانە سەنەدەکە هشام بن حجیرـی تێدایە، کەچی سوفیان خۆی لێی ڕیوایەتدەکات و شەرحیشی دەکات کە کوفری بچوکە، ئیمام احمدـیش ئەم شەرحەی سوفییان نەقل دەکات، **کەسیشیان باسی زەعیفی هیشام و مونکەری ئەم ئەثەرە ناکەن و ڕەتی ناکەنەوە**. (قسەکانی داستان تەواو).

جا نامەوێت زۆر بچمە ناو تفاصیلی هشام بن حجیرەوە ئەوە لای هەموو کەس معلومە تەنانەت لای داستانیەکانیش کە هشام بن حجیر تضعیف کراوە و بە درۆزن ناو براوە، بەڵام مەبەستی داستان ئەوەیە کە مادەم کەسێکی ڕاستگۆی وەکو ئیمام احمد و سوفییان بن عیینة ئەثەرەکەیان هێانوە و کەسیشیان باسی زەعیفی ئەثەرەکەیان نەکردووە کەواتە ئەثەرەکە جێی سیقەیە، وە چونکە داستانیەکان دەڵێن: ئایا ئیمام احمد نەیزانی کە هشام درۆزنە؟ ئەی باشە ئەگەر درۆزنە چۆن ئەثەرەکەی نقل کرد؟، کەواتە لێرەدا داستانیەکان دەڵێت مادەم ئیمام احمد و سوفیان بن عیینة ئەثەرەکەیان نقل کرد کەواتە ناتوانین ڕەدی ئەثەرەکە بدەینەوە

بە ئیزنی الله دەڵێین: شێخەکەتان داستان قسەیەکی ضعیفی تصحیح کرد بەهۆی نقل کردنیەوە لەلایەن زانای راستگۆ و دەمپاکەوە، بۆ ئەمەیان دروستە و مقبولە؟، بەڵام بۆ کەسێکی راستگۆ و دەمپاکی دیکە مقبول نیە کە قولێك نقل بکات کە تەنها سەنەدەکەی نقل نەکردوە نەوەك سندەکەی نقل بکات و ڕاویەکی درۆزنی تێدابێت، ئەگەر بەدر رەخنە دەگرێت بەو جۆرە هێشتا دەبێت رەخنە لەوەی داستان بگرێت تا إبن عبدالبر، چونکە ئەوەی ئیمام احمد کەسێکی درۆزن و کذابی تێدایە بەڵام ئەوەی إبن عبدالبر سندەکەی تەنها باس نەکردوە، جا سەرەڕای ئەوەی ئەو ڕاستیەمان هەر زانیوە و نکۆڵی و ئینکاریمان نەکردوە کە قولەکەی إبن عباس ئەگەر جۆرێکیان یان دووەم جۆریان یان سێیەم جۆریان ضعیف بن، ئەوە دڵنیاییەوە چوارەم و پێنجەمیان صحیحن و کەس ناتوانێت

ئینکاری لە صحیحی ئەمانە بکات، بەڵام ئایا مەبەستی قولەکەی إبن عباس لەسەر تشریع و یاسادانانە پێچەوانەی شرعی الله و خۆخستنە جێگای الله یە، یان حوکم نەکردنی جار جار بەوەی الله دایبەزاندووە و تاوان و زوڵم لەحوکمی حاکمدا کە خەوارج هەم ئەمانەی تکفیر دەکرد هەمیش کەسێك کە کبیرەی ئەنجامدابا، جا زۆر ناچینە ناو تفاصیلەوە و سەرەڕای ئەوەی لەم کتێبەدا باسی ئەو جیاوازیە دەکەین بەڵام تفاصیلەکەی هەڵدەگرین بۆ بەرهەمەکانی داهاتومان إن شاء الله لە وەڵامدانەوەی داستان محمد و داستانیەکان لەسەر بابەتی حکم بغیر ما انزل الله.

دەزانم ئێستا تۆی خوێنەر چاوەڕێیت کە ڕاستگۆیی و دەمپاکی و دەستپاکی إبن عبدالبرت بۆ بسەلمێنین، کە بە ئیزنی الله تعالی لە خوارەوە قەولی چەندین زانای بەناوبانگی دوای إبن عبدالبر نقل دەکەین کە لەسەر إبن عبدالبر قسە دەکەن، لەوانە:-

١. إبن القيم لەسەر إبن عبد البر دەڵێت: "إنه إمام أهل السنة في زمانه".

واتە: ئیمامی ئەهلی سونە بوە لە زەمەنی خۆی.

إجتماع الجيوش (76)

٢. أبو علي الغساني لەسەر إبن عبد البر دەڵێت: لم يكن أحد ببلدنا في الحديث مثل قاسم بن محمد وأحمد بن خالد الجباب ولم يكن ابنعبد البر بدونهما، ولا متخلفا عنهما.

واتە: کەسێك نەبوە لەم وڵاتەی ئێمە لە حەدیثدا بەقەدەر قاسمی کوری محمد و ئەحمەدی کوری خالد الجباب شارەزا بێت **وە إبن عبدالبریش بێ ئەوان نیە، وە جیاوازیشی نیە لەگەڵ ئەوان.**

سير أعلام النبلاء (18/327)

٣. وە هەر أبو علي الغساني دەڵێت: "ألف أبو عمر في الموطأ كتبا مفيدة منها : كتاب "التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد" فرتبه على أسماء شيوخ مالك، على حروف المعجم، وهو كتاب لم يتقدمه أحد إلى مثله".

واتە: أبو عمر(إبن عبدالبر) کتێبێکی بەسودی لەسەر الموطأ(ی ئیمام مالك) نوسیوە بەناوی "التمهيد لما في الموطأ من المعاني والاسانيد" وەرێکی خستون لەسەر ناوی شێخەکانی ئیمام مالك، وە لەسەر پیتە موعجەمەکان، **وە ئەوە کتێبێکە کە هیچ کەس پێشتر وەکو ئەو نەیتوانیوە پێشکەشی بکات**.

٤. وە أبو الوليد الباجي لەسەر ابن عبد البر دەڵێت: "لم يكن بالأندلس مثل أبو عمر بن عبد البر في الحديث، وهو أحفظ أهل المغرب".

واتە: **لە ئەندەلوس کەس وەك ابن عبدالبر** (شارەزا) **نەبوە لە حەدیسدا، وە ئەو حافزترینی خەڵکی رۆژئاوا بووە**.

الصلة لابن بشكوال (677/2)، وفيات الأعيان لابن خلكان (66/7)، سير أعلام النبلاء للذهبي (157/8)

٥. وە أبو عبد الله بن أبي الفتح لەسەر إبن عبد البر دەڵێت: "كان أبو عمر أعلم من بالأندلس في السنن والآثار واختلاف علماء الأمصار".

واتە: **أبو عمر** (إبن عبدالبر) **لە زاناترین بوە لە ئەندەلوس لە سونەت و ئاثار و ئیختیلافی زانا جیاوازەکانی ناوچە جیاوازەکان**.

تاريخ الإسلام للذهبي(142/21)

٦. وە الذهبي بەهەمان شێوە لەسەر إبن عبد البر دەڵێت: "وكان في أصول الديانة على مذهب السلف، لم يدخل في علم الكلام، بل قفا آثار مشايخه رحمهم الله".

واتە: لە بنەڕەتی دیندا **لەسەر مەزهەبی سەلەف** بوە، وە **داخلی عیلمی کەلام نەبوە**، بەڵام شوێنپێی شیخەکانی پێشخۆی گرتوە رەحمەتی اللەیان لێبێت.

سير أعلام النبلاء (18/161)

٧. وە **الحميدى**ش لەسەر إبن عبدالبر دەڵێت: "إبن عبد البر أبو عمر فقيه حافظ مكثر، عالم بالقراءات وبالخلاف، وبعلوم الحديث والرجال، قديم السماع، يميل في الفقه إلى أقوال الشافعي".

واتە: إبن عبدالبر فەقێیەکی حافز و باڵادەست بووە، زانا بوە بە خوێندنەوەکان و **زانا بوە بە خیلافی زانایان، وە بە عیلمی حەدیث** و زانایانی جرح و تعديل، وە گوێبیستی (زۆربەی اقوالەکانی سلف) بوە، لە فیقهدا قسەکانی بەلای مەزهەبی شافعیدا دەڕۆن.

سير أعلام النبلاء (18/327)

٨. وە **أبو القاسم بن بشكوال** دەڵێت: "إبن عبد البر إمام عصره".

واتە: إبن عبدالبر ئیمامی چەرخی خۆی بووە.

سير أعلام النبلاء (18/153)

٩. وە **أبو علي بن سكرة** دەڵێت: "سمعت أبا الوليد الباجي يقول : لم يكن بالأندلس مثل أبي عمر بن عبد البر في الحديث، وهو أحفظ أهل المغرب".

واتە: گوێم لە أبا الوليد الباجي بوە کە دەڵێت: لە ئەندەلوس کەس وەکو أبي عمر بن عبدالبر نەبوە لە حەدیسدا، وە ئەو حافزترینی خەڵکی مەغریب بوە.

١٠. وە شيخ الإسلام **إبن تيمية** لەسەر إبن عبدالبر دەڵێت: "إنه إمام المغرب".

واتە: ئەو ئیمامی مەغریب(ڕۆژئاوا) بووە.

مجموع الفتاوى (5/59)

١١. وە هەر **إبن تيمية** لەسەر کتێبی التمهيد کە إبن عبدالبر لەسەر الموطأی ئیمامی ماليك نوسيويەتی دەڵێت: "الشرح الذي لم يشرح أحد مثله".

واتە: ئەوە ڕوونکردنەوەیەکە کە کەس بەو جۆرە ڕونکردنەوەی نەداوە (لەسەر الموطأی ئیمامی مالك). فتاوى الكبرى (6/613)

١٢. وە هەر إبن تيمية دەڵێت: "وهو أجل ما صنف في فنه".

واتە: ئەو لە هونەری خۆیدا باشترین بووە.

مجموع الفتاوى (3/263)

١٣. وە دەڵێت: "وهو أشرف كتاب صنف في فنه".

واتە: ئەو کتێبە(التمهيد) بەنرخترین کتێبە کە لە هونەری خۆیدا نوسراوە.

مجموع الفتاوى (3/220)

١٤. وە دووبارە إبن تيمية دەڵێت: "إنه من أعلم الناس بالآثار والتمييز بين صحيحها وسقيمها".

واتە: ئەو لە زاناترینی خەڵك بووە لە ئاثاری سلف وە جیاکردنەوەیان لە نێوان ڕاست و ناڕاستیاندا.

درء التعارض (7/157)

١٥. وە لە کۆتاییدا محمد بن عبد الوهاب لەسەری دەڵێت: "إنه إليه المرجع في كلام الله وكلام رسوله وكلام السلف".

واتە: دەگەڕێینەوە بۆ لای ئەو لە کەلامی الله و کەلامی رسولەکەی صلى الله عليه وسلم و کەلامی سەلەف.

مؤلفات 256

جا بە ئیزنی الله دەڵێم: زانایانی پاش خۆی ئەوەندە بە ڕوونی باسیان لە إبن عبدالبر کردووە ئەسڵەن هیچیان نەهێشتۆتەوە بۆ ئێمە تا بیڵێین، لە شاهیدی بۆ راستگۆیی و دانایی و دەستپاکی إبن عبدالبر، نەك ئەمە بگرە بە زاناترینی کەسیان لە عیلمی حەدیث و ئاثاری سلفدا بینیوە، هەم لە مغرب هەم بگرە لە هەموو دنیا لە زەمەنی خۆیدا، جا زانایەك بەم جۆرە زانا نزیکەکانی زەمەنی خۆی شاهیدی لەسەر راستگۆیی بدەن، بەدر خورماڵیەك کێیە کە دواى 1100 ساڵ بێت و پێی

بڵێت جەهمیە؟، چجای بگات بەوەی بە درۆزن ناوی بەرێت کە بڵێت مادەم سەنەدی قولەکەی دیار نیە کەواتە قسەکەی لێ وەرناگیرێت، جا ئەم بەدر خورماڵیە دیارە إبن عبدالبر بە درۆزن و خائین دەزانێت، قسەکەی ئەوە دەگەیێنێت کە إبن عبدالبر درۆی بەدەم زانایانەوە کردووە لە کاتێکدا إبن عبدالبر بە حاڵی ئەو زانایانە شارەزا بووە و نزیك بوە لێیانەوە وئاگاداری حاڵیان بووە، هەروەکو شاهێدیان بۆ داوە بەو حەدە شارەزا بویێت بە حەدیس و ئاثاری سلف و توانیبێتی صحیح و ضعیفیان جیابکاتەوە ئەسڵەن ئەوە کەی جێگەی گومانە کە قولێك بەبێ سند نقڵ دەکات؟

ئینجا پێش ئەوەی ئەم داستانیانە دەستپێشخەری بکەن و شوبهە دروست بکەن با لێرەوە وەلامیان بدەینەوە، برای موحد بۆ زانیاریت لەسەرەتادا إبن عبدالبر ظاهری بوە و ئینکاری قیاسی دەکرد بەلاّم لەپاشاندا چوەتە سەر مەزهەبی ئیمامی مالیك و ڕاکانیشی لە ئیمامی شافعیەوە زۆر نزیك بوون، بەڵگەشمان بۆ ئەمە:-

لەسەر ئەمە الذهبي لە سير أعلام النبلاء دا دەڵێت: "إبن عبد البر كان إماما دينا، ثقة، ثبتا، متقنا، علامة، متبحرا، صاحب سنة واتباع، وكان أولا أثريا ظاهريا فيما قيل، ثم تحول مالكيا مع ميل إلى فقه الشافعي في مسائل، ولا ينكر له ذلك، فإنه ممن بلغ رتبة الأئمة المجتهدين".

واتە: إبن عبدالبر ئیمامێکی خۆبەکەمگر و جێی سیقە و خۆڕاگر و زانا بوە و وەکو دەریا وابوە لە عیلمدا و ئەهلی سونە و جەماعەش بوە، **وە سەرەتا وەکو ئەوەی باسدەکرێت ظاهری بوە** (ئەوانەی کە ئینکاری قیاس دەکەن)، **بەلاّم دواتر گۆڕا بۆ مەزهەبی ئیمامی مالیك**، لەگەڵ نزیکبوونەوەی بۆ مەزهەبی ئیمامی شافعی لە هەندێك بابەتدا، کە ئینکاری ئەمەی لێ ناکرێت، وە یەکێك بووە لەو ئیمامانەی کە گەشتوەتە حەدی ئەو زانایانەی کە ئیجتیهادیان کردووە.

وە بە هەمان شێوە الذهبي لە هەمان سەرچاوەدا دەڵێت : "كان أبو عمر أعلم من بالأندلس في السنن والآثار.. وكان في أول زمانه ظاهري المذهب مدة طويلة ثم رجعإلى القول بالقياس من غير تقليد أحد".

واتە: أبو عمر(إبن عبدالبر) لە زاناترینی ئەندەلوس بووە لە سونەت و ئاثاری سلف، **وە لە سەرەتاوە لەسەر مەزهەبی ظاهری بوە بۆ ماوەیەکی درێژ، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ وەرگرتنی قەول بە قیاس بەبێ تەقلید کردنەوەی کەس.**

وە جلال الدين السيوطيش لەسەر ئەم بابەتە دەڵێت:"وكان أولا ظاهريا ثم صار مالكي".

واتە: سەرەتا ظاهری بوو پاشان بوو بە مالکی.

دەڵێم: ئەمە هەروەکو هێنانە پێش چاوێك پێتان دەڵێم ژیانی مرۆڤ گۆڕانکاری بەسەردا دێت و بۆی هەیە مرۆڤ لە ژیانیدا لەسەر چەندین بیروباوەردا بێت و لەسەر چەندین رای جیاوازدا بێت، بۆیە مرۆڤێك کە لە کۆتایی تەمەنیدا یان لە کاتێکی دیاریکراودا خۆی بەریدەکات لە کارێك یان ڕایەکی پێشوی تەواو ئیتر ئەو شتەی یان قسەیەی لە ڕابردوودا کردویەتی ماڵ نیە بەسەریەوە.

ئەمە هەر نمونەیەکە لە سەلماندنی ساویلکەیی داستانیەکان لەوەی کە هەندێ زانایان تکفیر کردووە کە لە ژیانیاندا چەندین جار تەوبەیان کردووە یان لەسەر بیروبۆچونی پێشویان نەماون لەوانە أبو حنیفە کە دووجار تەوبەی پێکراوە لەسەر شتی جۆراو جۆر، جا با سبەی دوو سبەی داستانیەکان نەچن قەولی کۆنی إبن عبدالبرمان بۆ نقل کەن گوایە إنکاری قیاسی کردوە، گوایە فلانە قسەی کردوە لەفلانە شوێن، چونکە لەسەر مەزهەبی ظاهری وازی هێناوە و چووەتە سەر مەزهەبی ئیمامی مالك.

جا بۆیە بابەتەکەمان دورودرێژکردەوە بۆ سەلماندنی ئەوەی إبن عبدالبر جەهمی نیە بۆ ئەوەی بۆ هەمووڵایەك ڕوونببێتەوە کە ئەم داستانیانە:

- چەنێك بێ عیلم و چەواشەکارن.
- هەر زانایەك قسەیەك پێچەوانەی خۆیان بکات بەبێ ئەوەی جەهمی بێت دەیکەن بە جەهمی بەبێ ئەوەی ئەشعەری بێت دەیکەن بەئەشعەری، بەڵام قسەی جەهمیە ئەسڵیەکان و ئەشعەریە ئەسڵیەکان و موعتەزیلە ئەسڵیەکان و ئیبازیە ئەسڵیەکان ئەگەر لەگەڵ فکرە پوچەکەی خۆیان بێت یان وا دەربکەوێت لەگەڵ فکرە پوچەکەی خۆیانە بە گومانە باطلەکەیان یەکسەر بێ دودڵی نقلی دەکەن و بە ڕوویەکی زۆر قایمیشەوە وەکو داستان محمد دەڵێت مادەم قسەکانیان لەگەڵ سلف گونجاوە وەری دەگرین "تەبعەن ڕاست نیە وادەردەکەوێت لەگەڵ فکرە پوچەکەی خۆیانە نەك سلف".

- بۆ ئەوەی بۆتان دەرخەین چەندێك بێ ئەدەبن بەرامبەر ئەهلی عیلم، و چەندێك خۆیان بە شت دەزانن و خۆیان بە گەورە دەزانن، ئاخۆ دەبێ بەرامبەر ئێمە چۆن بن کە هەموو عیلمەکەمان ناگاتە عیلمی ڕۆژێکی زانایان.

# شوبهەی سێیەمی بەدر

بەدر لە لاپەرە 5 دا دەڵێت: (باشە لەگەڵ ئەوەدا خۆ إبن عبدالبر ناڵێت حكم بغير ما انزل الله كوفری گەورەیە بەڵكو دەڵێت كوفری بچوكە، چۆن شتی وا نقڵ دەكات دوای هەر خۆی پێچەوانەی خۆی دەكاتەوە)

بە ئیزنی الله تعالی دەڵێم: ئەمە نیشانەی ئەوپەڕی بێ عیلمی و مێشك منداڵی و جاهیلی داستانیەكانە كە ئەم قسانە دەكەن، وە ئەمە نیشانەی ئەوپەڕی ساویلكەیی و نەفامی و نەزانی داستانیەكانە ئەم قسانە دەكەن، دەمڕاستەكەیان ئەمە ئەقڵی بێت ئاخۆ دەبێت ئەوانەی خوارەوەیان چ بێ عیلمێك بن، ئاخۆ كاكی داستانی دڵ بە چ خۆش دەكەیت ئەمە دەمڕاستتە و شوێنی دوو كەسی ئاوا مێشك منداڵ و نەزان كەوتویت، لەوەلامدا بۆ ئەم قسە مندالانە دەڵێین:

ئێمە لەوەتەی دەستمان كردووە بە ڕەددانەوە داستانیەكان جەختمان لەسەر ئەوە كردوەتەوە كە حوكم نەكردن بەوەی الله دایبەزاندووە دووجۆرە:-

١) حوكم نەكردن بەوەی الله دایبەزاندوە لە یاسادانانی بنەڕەتی وڵاتدا واتە لە دەستوردا.

٢) حوكم نەكردن بەوەی الله دایبەزاندوە لە جێبەجێ كردنی ئەو یاسایانەی ناو دەستورەكەدا.

بۆ نمونە، حاكمێكی موسوڵمان هەموو ئەو یاسایانەی كە الله تعالی لە قورئان ئەمری پێكردوون و رسول الله صلى الله عليه وسلم فرمانی پێكردووین لە دەستووردا چەسپاندووە و هیچ دانە یاسایەكی لە دەستور لانەداوە و هەمووی لە دەستوری وڵاتدا لە مەحكەمە و دادگاكاندا جێبەجێ دەكات بەسەر خەڵكدا بێ جیاوازی، بەڵام لە جێبەجێ كردن و تنفیذی ئەو یاسایانەدا جار جارە لەبەر خزمایەتیەك لەبەر ناسراویەك لەبەر ڕەشوەیەك حوكمێكی الله جێبەجێ ناكات

(إبن بطة لە کتێبی الإبانة لە بابی (ئەو تاوانانەی کە خاوەنەکەی بەرەو کوفرێکی دەرنەکەر لە دین دەبات) دا قەولەکەی إبن مسعود نقل دەکات کە دەڵێت ڕەشوە لە حوکمدا کوفرە و بە کوفری بچوکی عملی وەسفی دەکات نەوەك کوفرێکی گەورەی دەرکەر لە دین.)

یان چەند جارێکیش حوکمی الله جێبەجێ ناکات ئەگەر خۆی بە تاوانبار زانی و إستحلالی کارەکەی نەکرد ئەوە کوفرێکی بچوکی ئەنجام داوە وە قولەکەی إبن عباسیش و هەموو ئەهلی عیلمیش لەسەر ئەمەیە، وە إبن عبدالبر هەر مەبەستی ئەمەیە کە لە التمهيد (٥/٧٤) دەڵێت:

"و أجمع العلماء على أن الجور في الحكم من الكبائر لمن تعمد ذلك عالما به ، رويت في ذلك آثار شديدة عن السلف و قال الله عز وجل (و من لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون )، ( الظالمون)، ( الفاسقون) نزلت في أهل الكتاب ، قال حذيفة و إبن عباس ، هي عامة فينا ،قالوا ليس بكفر ينقل عن الملة إذا فعل ذلك رجل من أهل هذه الأمة حتي يكفر بالله و ملائكته و كتبه و رسله و اليوم الآخر".

واتە: زانایان ئیجماعیان لەسەر ئەوە هەیە کە زوڵم و زۆر لە حوکمدا لە کبائرەکانە بۆ هەرکەسێك کە بە ئەنقەستی و بە عیلمەوە کردی، لەسەر ئەمە ئاثاری زۆر توند لەسەر سەلەفەوە هاتووە وە الله عزوجل دەفەرمێت (و من لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون)،( الظالمون)،( الفاسقون) کە لەسەر ئەهلی کیتاب دابەزیوە، حوزەیفە و إبن عباس دەڵێن، ئەوە لەسەر ئێمەشە، وە گوتوشیانە کوفرێك نیە لە دین دەرکەر بێتکە ئەگەر پیاوێك لە ئەهلی ئەم ئوممەتە کردی هەتاوەکو کافر ببێت بە الله و مەلائیکەت و کیتابەکەی و رسولەکەی و ڕۆژی دوایی.

التمهيد (٥/٧٤)

بە ئیزنی الله تعالی دەڵێم: ئەمە ڕای إبن عبدالبرە لەسەر زوڵمکردن لە حوکمدا و حوکمنەکردنی حاکم لەوەی کە الله دایبەزاندووە، با باباتەکە تەواو بکەین و بزانین ئایا هیچ تناقضێك هەیە لە نێوان ئەم قولەی إبن عبدالبر لەگەڵ

قولەکەی دیکەیدا کە لە ئیمام إسحاقەوە نقلی دەکات، کە بە ئەقڵە پوچەکەی داستانیەکان دژیەکی لە نێوان ئەم دوو قەولەدا هەیە کە چوون ئەوەی بە دڵی خۆیانە لێیەوە قبوڵیان کردووە و ئەوەشی دژی خۆیانە ڕەتیانداوەتەوە.

با بزانین ئەو حوکم نەکردنەی کە مرۆڤی پێ کافر نابێتەوە تا چ کاتێك بەکارە کە ئیمام إبن عبدالبر لەم بارەوە إجماعی نقل کردوە لەسەر کافر نەبوونی ئەوکەسەی کە هەم زوڵم لە حوکمدا دەکات و هەمیش حوکم ناکات بەوەی الله دایبەزاندووە،

با ڕوونی بکەینەوە ئەم حوکم نەکردنە کە کفر دون کفرە تا کوێ قبوڵە و لە کوێوە لە کفر دون کفر دەردەچێت بەرەو کوفری گەورەی دەرکەر لە ئیسلام.

جا با بچینەوە سەر نمونەکەمان لەسەر حاکمە موسوڵمانەکە کە لە دەستوردا هەموو یاساکانی ئیسلامی چەسپاندبوو وە پابەند بوو پێیانەوە لە باطن و لە ظاهر لە إعتقاد و لە عمل پێکردنیان، جا ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بە پڕۆژە یاسا گۆڕانکاری و تبدیلی کرد لەم دەستورەدا کە لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتبوو و تەنها یەك یاسای دەرهێنا کە الله ئەمری پێ کردووە و دووری خستەوە و پەکی خست و وازی لە حوکم کردنپێی هێنا (کە ئەگەر یاساکانی دیکەی ئیسلام لە دەستوردا بهێڵێتەوە و تەنها یەك یاساش پەك بخات)، ئەم حاکمە لێرەدا مورتەد دەبێتەوە و قولەکەی إسحاق بن راهویە کە إبن عبدالبر نقلی دەکات و شی دەکاتەوە لەسەر ئەم جۆرە حوکم نەکردنەیە کە دەفەرمێت: "أو دفع شيئا ممالنزل الله".

واتە: ئەگەر شتێکی دوور خستەوە لەوەی کە الله دایبەزاندووە.

وە دەفەرمێت: "أنە کافر بذلك، وإن کان مقرا بکل ما أنزل الله".

واتە: ئەوە کافرە بەم کارەی کە ئەگەر دانیش بنێت بە حەق بوونی ئەوەی کە الله دایبەزاندووە.

واتە ئەگەر ئەو حاکمەی کە ئەم یاسا ئیسلامیەی لە دەستور دا دفع کردووە و لایبردووە و لە کارکردن دووری خستوەتەوە ئەگەر خۆشی بەتاوانبار بزانێت ئەوە هەر کافرە مادام وازی هێناوە لە جێبەجێکردنی حوکمێکی الله.

ئینجا ئەی ئەو کەسەی کە الله تعالی دوو چاوی ساغی پێداویت و ئەقڵێکی سەلیمی پێ داویت، لێت دەپرسم بەڵام بە ویژدانەوە وەڵامبدەرەوە، إبن عبدالبر لە کوێدا مخالفەی خۆی کردوە؟ لە کوێدا دژی خۆی قسەی کردووە؟ لە کوێدا پێچەوانەی خۆی قسەی کردووە؟

قسەکەی یەکەمی کە إجماع نقل دەکات و لە إبن عباسیشەوە قەول نقل دەکات، کە ئەمە لەسەر حوکم نەکردنی حاکمە بەوەی کە الله دایبەزاندووە لەگەڵ پاراستنی ئەو حوکمەی کە حوکمی پێ نەکردووە و لە کار نەخستنی و هێشتنەوەی لە دەستوور و حوکم پێ کردن لە کاتەکانی دیکەدا.

لەم کاتەدا بەڵێ کفر دون کفرە و پێی کافر نابێتەوە و هیچ گومانێکمان لەمەدا نیە، بەڵام ئەگەر بە یاسا وەرێت بنوسێت زیناکار هیچ حوکمێکی نیە لە وڵاتی ئێمەدا ئەگەر دوو کوڕ و کچ زینایان کرد کەس بۆی نیە تەداخولیان بکات و ئەوەشی لێیان تێکبدات و ئیزعاجیان بکات سزا دەدرێت، ئەگەر ئەمەی لە جیاتی حوکمی جەڵد یان ڕەجم بەسەر خەڵکیدا سەپاند و خەڵکی پێوە پابەند کرد، ئەگەر خۆشی بەتاوانبار بزانێت و بە دەمیش نەڵێت کارەکەی من حەلالە، هەر کافر دەبێت بەم کارە وە لایەنی جێبەجێکاریش ئەگەر ئەم یاسایە بەسەر خەڵکیدا جێبەجێ بکات ئەوە گوێڕایەڵی خوایەکی بێجگە لە خالقی ئەرز و ئاسمانی کردووە و پەرستویەتی، جا ئەمە استحلالی زینا نەبێت چی استحلالی زینایە؟

جا بۆ یەکلا کردنەوە و ڕوونکردنەوەی تەواوی ئەم بابەتە و جیاکردنەوەی حوکم نەکردنی جار جار لە حوکم نەکردنی دەستور سەرنجتان بۆ قەولێکی إبن

تیمیه و قەولێکی محمد بن إبراهیم آل شیخ ڕادەکێشم کە سەرەڕای ئەوەی إبن تیمیه بەلای داستانیەکانەوە جەهمی و کافرە بەڵام داستان محمد وەکو تەحەدایەك بۆمان لە کتێبەکەیدا قسەکانی هەردووکیان نقل دەکات دەڵێت مادەم قسەکانیان مطابقی سەلەفن بەلامانەوە قبوڵن، بەڵام ئەم قسانەی خوارەوە کە دژی داستانیەکانن مطابقی سەلەف نین و وەریان ناگرن

١) إبن تیمیة دەڵێت:

قال تعالی: {فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما} ﴿النساء:٦٥﴾، فمن لم يلتزم تحكيم الله ورسوله فيما شجر بينهم فقد أقسم الله بنفسه أنه لا يؤمن، وأما من كان ملتزما لحكم الله ورسولة باطنا وظاهرا، لكن عصى واتبع هواه؛ فهذا بمنزلة أمثاله من العصاة. وهذه الآية مما يحتج بها الخوارج على تكفير ولاة الأمر الذين لا يحكمون بما أنزل الله، ثم يزعمون أن اعتقادهم هو حكم الله.

واتە: الله تعالی دەفەرمێت: (نەخێر وانیە کەخۆیان بە باوەڕدار نیشیان دەدەن سوێند بەپەروەردگارت بڕوا دارنین تاتۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەکیەکی نێوانیان دا لە پاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بەهیچ بێزارییەك لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ نەبن بە ملکەچیەکی تەواو) ﴿النساء:٦٥﴾، __**هەرکەس پابەند نەبێت بە کردنە دادوەری الله و رسولەکەی لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکیەکی نێوانیاندا الله تعالی سوێندی بە نەفسی خۆی خواردووە کە ئیمانی نیە**__(واتە کافرن)، __**بەڵام ئەوەی پابەند بوو بە حوکمی الله و رسولەکەی لە ناخەوە و لە ڕوکەشدا**__(واتە لە دڵەوە و لە عملدا) **بەڵام تاوانی کرد و شوێنی ئارەزووەکانی کەوت، ئەمە خۆی لە تاوانبارانە**، وە ئەم ئایەتەش خەوارج بەکاریدەهێنێت بۆ تکفیر کردنی ئەو وەلی ئەمرانەی کە حوکم ناکەن بەوەی الله دایبەزاندوە (بە مەرجێك وەکو إبن تیمیە خۆی باسی کرد ئەو وەلی ئەمرانە پابەند بن بە حوکمی الله

و رسولەکەیەوە لە ناخ و لە ڕوکەشدا)، پاشان واگومان دەبەن کە بیروباوەڕەکەیان حوکمی اللەیە.

منهاج السنة (١٣٠/٥)

بەئیزنی الله دەڵێم: إبن تیمیه لێرەدا زۆر بەجوانی باسی ئەم بابەتە دەکات و شتەکە ڕوون دەکاتەوە و قولەکەی دوو بڕگەیە:-

**بڕگەی یەکەم**: دەڵێت هەرکەس پابەند نەبێت بە کردنە دادوەری الله و رسولەکەی صلى الله عليه وسلم لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکیەکی نێوانیاندا ئەوە الله سوێندی خواردوە کە کافرە، جا ئەگەر ئەو کەسانەی کە الله ناکەنە دادوەر لە کاتی کێشەکانیاندا کافر بن، کەواتە ئەو حاکمانەشی کە وا دەکەن حوکمی الله و رسولەکەی نەبێتە دادوەر بەسەر خەڵکەوە و منعی بەکار بوونی ئەم حوکم و یاسایانە دەکەن و ڕێگری دەکەن لەوەی کە خەڵك الله و رسولەکەی بکەنە دادوەر لە کاتی کێشەکانیاندا وە حوکم و یاسای الله و رسولەکەی لە دادگاکاندا دەسڕنەوە و لە کاری دەخەن و پەکیدەخەن و حوکمی پێ ناکەن و دەشیچەسپێنن بەسەر خەڵکیدا و دەبنە هۆکاری ئەوەی غەیری الله و رسولەکەی ببنە دادوەر بەسەر خەڵکیدا ئائەو حاکمانەش بە هەمان شێوە کافرن.

**بڕگەی دووەم**: لە بڕگەی دووەمدا ڕوونی دەکاتەوە بۆمان کە ئەو حاکمانەی لە باطن و لە ظاهیردا إلتزامیان هەیە بۆ حوکمی الله بەڵام تاوانی کرد و شوێنی ئارەزوەکانی کەوت ئەوە کافر نابێت وە دەشڵێت خەوارج ئەم ئایەتە بەکاردەهێنن بۆ تکفیری ئەو وەلی ئەمرە موسوڵمانانەی کە حوکم ناکەن بەوەی الله دایبەزاندوە، بەڵام کام وەلی ئەمرانە؟، ئەو وەلی ئەمرانەی کە وەك خۆشی لەسەرەوە باسی کرد إلتزامیان هەیە بە حوکمی الله و رسولەکەیەوە لە باطن و لە ظاهیریشدا بەڵام جار جارە شوێن ئارەزووەکانی دەکەوێت و حوکم ناکات بەمە کافر نابێت، بەڵام ئەگەر پابەند نەبوو بە حوکمی الله و رسولەکەیەوە لە باطن و لە ظاهر ئەوە ئیمانی نەهێناوە و کافرە، جا ئەم

قسەیە ڕێك هەمان مفهومەکەی ئێمە بوو بۆ بابەتەکە، کە ئەگەر لە دەستووردا حاکم هەموو ئەو یاسایانەی کە لە قورئان و سونەتەوە وەریگرتبوون پاراست و إلتزام و پابەند بوو پێیانەوە، بەڵام زوڵمێکی کرد یان جار جارە حوکمی نەکرد بەوەی الله دایبەزاندووە ئەمە کافر نیە و خەوارج ئەم ئایەتە بەکاردەهێنێت بۆ تکفیر کردنی ئەو حاکمەی کە حوکم ناکات بەوەی الله دایبەزاندوە.

٢) وە محمد بن إبراهيم آل الشيخ لە نامەیەکیدا بە ناوی (تحكيم القوانين) دەڵێت: "وأما الذي قيل فيه كفر دون كفر ، إذا حاكم إلى غير الله مع اعتقاد أنه عاص وأن حكم الله هو الحق، فهذا الذي يصدر منه المرة ونحوها، أما الذي جعل قوانين بترتيب وتخضيع فهو كفر، وإن قالوا أخطأنا وحكم الشرع أعدل".

واتە: بەڵام ئەوەشی کە گوتراوە کفر دون کفرە، کاتێکە حوکمی بە غەیری حوکمی الله کرد لەگەڵ إعتقادیدا کە ئەو تاوانبارە و حوکمی الله ـیپێ باشترە، **ئەمەش تەنها بۆ ئەو کاتەیە کە جارێك یان چەند جارێك حوکم ناکات بە حوکمی الله**، **بەڵام ئەوانەی کە یاسادادەنێن بە ڕیزبەندی و بە ملکەچکردنی خەڵکی پێوەی ئەوە کوفرە، تەنانەت ئەگەر بشڵێن هەڵەمان کرد و حوکمی الله دادپەروەرترە**. قسەکانی تەوە

شتەکان زۆر ئاشکرا و ڕوونن بۆ ئەو کەسەی کە الله مێشکێکی سەلیمی پێ داوە و لەوە زیاتر باسکردنی ناوێت.

وە شوبهەیەکی دیکە کە داستانیەکان و مەدخەلیەکان زۆرجار بەکاری دەهێنن بۆ لێدانی ئەهلی تەوحید و خستنە ناوەوەیان و سەرلێتێکدانیان، کە هەروەکو بەدر خورماڵی خۆیشی باسیدەکات دەڵێت حوکمی الله تەنها حەدە شەرعیەکان ناگرێتەوە و هەموو ئەمرەکانی الله دەگرێتەوە، جا بەم قسەیە دەیانەوێت بە ئێمە بڵێن ئێوە بە ئایەتی (ومن لم يحكم بما انزل الله فأولئك هم الكافرون)

تکفیری ئەو حاکمە دەکەن کە تەنها لە حەدە شەرعیەکاندا حوکم ناکات بەوەی الله دایبەزاندوە وەکو دەستبڕینی دز و رەجم، جا دەیەوێت بڵێت چ جیاوازیەك هەیە لە نێوان حەدە شەرعیەکان و ئەمرەکانی دیکەی الله لە خواردنەوەی مەشروب و دزی کردن و نەزەرکردن وە دەڵێت هەموو ئەمانە حوکم نەکردنن و جیاوازی نیە لە نێوان ئەمانە و حەدە شەرعیەکاندا، وە دەڵێت ئیتر بۆچی حاکم کە مشروب دەخواتەوە تکفیری ناکەن بەڵام کە حەدی مشروب خۆرێك جێبەجێ ناکات تکفیری دەکەن؟ وەکو ئەوەیە کە ئەم داستانیانە ئاگاداری حاڵی ئێمە نین کە ناڵێین و نەمانگوتوە: ئەگەر حاکمێك دەستی دزێك نەبڕێت ئیتر کافرە.

لە وەڵامدا:- وەکو پێشتر باسمان کرد حوکم نەکردن لە دەستووردا جیایە و لە جێبەجێکردندا جیایە.

بە دوو نمونە ئەم بابەتە ڕوون دەکەینەوە

I. بۆ نمونە حاکم خزمێکی مەشروب خۆری خۆی دەبینێت و دارکاری ناکات و حوکمی الله ـیبەسەردا جێبەجێ ناکات، ڕاستە حوکمی نەکردووە بەڵام بەمە کافر نابێتەوە.
II. ژنەکەی حاکم حیجاب نیە و بە سفوری دەگەڕێت بەمەش هەر تاوانی ئەنجام داوە و پێی کافر نابێتەوە.

جا داستانیەکان دەڵێن هەردوو حاڵەتەکە حوکم نەکردنە بەڵام بۆچی بەلاتانەوە دانەیەکیان کوفرە دانەیەکیان کوفر نیە.

لەکاتێکدا وا نیە! بەلامانەوە هیچکام لەوانەی سەرەوە کوفر نین، بەڵام بەم جۆرەی خوارێ هەردووکی دەبنە کوفر ئەگەر جحد و ئینکاریشی تێدا نەبێت:-

ئەگەر حاکمەکە هەستا و بە یاسا لە دەستوردا گوتی:

I. هەر کەسێك مەشروب بخواتەوە، هیچ حوکمێکی نیە لە وڵاتی ئێمەدا، مەشروب خواردنەوە هیچ سزایەکی نیە با خەڵکی بۆ خۆی مەشروب بخواتەوە، وە دەشزانین حوکمی الله حەقە بەڵام ئامادە نین تطبیقی بکەین.

II. لە وڵاتی ئێمەدا کەس بۆی نیە حیجاب بکات حیجاب ممنوعە، سەرەڕای ئەوەی دەزانین کە حیجاب فەرزە و ڕێزیشی دەگرین و سوکایەتیشی پێ قبوڵ ناکەین بەڵام لە وڵاتی ئێمە کەس بۆی نیە حیجاب بکات و حەزمان لە سفوری و بەڕەڵاییە و دەشزانین کە حوکمی الله حەقە بەڵام ئامادە نین جێبەجێی بکەین.

لە هەردوو حاڵەتەکەی سەرەوەدا حاکم پێی کافر دەبێتەوە سەرەڕای ئەوەی دانیشی دەنا بەوەی کە الله دایبەزاندووە، کە ئەو دانپێدانانەی هیچ سودی پێ ناگەیێنێت بە بەڵگەی قەولەکەی ئیمام إسحاق ، وە چونکە بە یاسا پێچەوانەی قورئان و سونەت یاسای داڕشت، دژ بە یاساکانی الله و یاساکان و ئەمرەکانی الله ــ ی دوورخستەوە و کاری پێنەکردن و خەلکی مەنع کردلە کارکردن پێیان، ئەوە پێی کافر بوەوە، جا هیچ جیاوازی نیە لە نێوان حوکم نەکردن لە حەدەکان و حوکم نەکردن لە ئەمرێك لە ئەمرەکانی الله تعالی کە معلوم من الدين بالضرورەن (کە پەك خستن و دوورخستنەوە و هاتنە دەر لە گوێڕایەڵی کردن و ملکەچبوونی ئەو ئەمرەی الله کە معلوم من الدين بالضرورة بێت کوفرە بە الله، لە کاتێکدا ئەنجامدانی تاوانەکان تاوانە نەوەك کوفر) کە یاسادارِشتن پێچەوانەی هەر شتێك لەم ئەمرانەی الله تعالی لە ناو دەستور و یاسادا کوفرە بە خالقی ئەرز و ئاسمان، وە قولەکەی إسحاق بن راهويه و إبن عبدالبر لەسەر ئەمەیە.

ئەم شوبهە و پرسیارەی مەدخەلیەکان و داستانیەکان لەوەوە دروست بووە کە چونکە ئەوەی زیاتر بەربڵاوە لە وڵاتانی عەرەبی و بەناو ئیسلامی حوکم نەکردنە بەم حەددە شەرعیانە، بە واتایەکی دیکە ئەم حەدە شەرعیانە زۆر ئاشکران و وازحن و لە دورەوە دیارن، یەکەم شت کە حاکمی طاغوت و کافر

وازیان لێدەهێنێت ئەم حەدە شەرعیانەیە جا بۆیە ئەمە هۆکارەکەیە کە وادەردەکەوێت تەها حەدە شەرعیەکان پەکبخرێن ئینجا حاکم کافرە نەخێر هەر شتێك لە ئیسلامەدا ئەمری پێکرابێت و بە إجماع حەرام کرابێت یان بە إجماع حەڵالکرابێت یان بە إجماع ئەنجامدانی فەرز بێت، هەر کاتێك حاکم بە یاسا هات و پێچەوانەی ئەمانەی نوسیوە چ لە حەلاڵکردنی حەرام یان پێچەوانەوە (کەمەرج نیە بدرێتە پاڵ الله) چ لە پەککستنی ئەمرێك لە جێبەجێ کردن ئەگەر بشزانێت تاوانی کردوە و جحدیشی نەکات هەر کافرە پێی، ئیتر با داستانیەکانیش بۆخۆیان وابزانن تەنها لە حەددە شەرعیەکان یاسادانان بە کوفر دەزانین.

جا قسەکەی إسحاق بن راهویە کە إبن عبدالبر باسی دەکات زۆر وازح و ئاشکرایە وە إجماعی زانایانیشمان نقل کرد لە راستگۆیی و دەمپاکی إبن عبدالبر، پێچەوانەی بەدر خورماڵی کە ئەو ئیمامە بەڕێزە بە جەهمی دەزانێت، جا تەحەدای بەدر خورماڵی و تاقمەکەی دەکەینیە کە دەلیلی جەهمی بوونی إبن عبدالبرمان بۆ بهێنێت کە قسەیەکی جەهمیەکان بکات، کە گریمان هێنایشی و إبن عبدالبر جەهمی بوو، باشە دەپرسم ئەمە ئەوپەڕی حەیاچوون نیە بۆ داستانیەکان کە جەهمیەك عمل لە ئیمان دەربکات لەپاڵ ئەوەشدا عملێکی وەکو (دوورخستنەوەی شتێك کە الله دایبەزاندووە) بە کوفر بزانێت کە ئەگەر خۆشی بە تاوانبار بزانێت؟ جەهمی عمل لە ئیمان دەرناکات؟ دەی ئێوە بە إبن عبدالبر ناڵێن جەهمی؟ دەی باشە تەریق بونەوەتان باشتر نیە لەم حاڵەتان؟ ئەوەندەی جەهمیەکانتان پێ ناگوترێ و ئەم بابەتە تەنانەت لای "جەهمیش" بڕاوەتەوە"گریمان إبن عبدالبر جەهمی بوو" کە تشریع و پەککستنی حوکمی الله لە کوفری أکبرە.

جا سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە سەلماندمان کە إبن عبدالبر جەهمی نیە هەم بە فتواکانی هەمیش بە شاهیدی زانایانی پاش خۆی بەڵام گریمان جەهمیش بێت، باشە بۆچی شێخەکەتان داستان محمد لە کتابەکەیدا دەڵێت ئێمە قسەی

هەندێك لە جەهمی و موعتەزیلە و ئیبازی وخەوارجەکان نقل دەکەین چونکە موافقی سەلەفن؟ بۆچی لە بەرژەوەندی خۆتان قسەی جەهمی نقل دەکەن بەڵام بۆ ئێمە حەرامە قسەی نقل بکەین؟

ئینجا تۆ کێیت لە ئاست ئەهلی عیلمدا کە قسە بە زانایان بڵێیت و بە درۆیان بخەیتەوە، لە کاتێکدا هەموو زانایانی دوای خۆی ئەگەر هەڵەشیان هەبووبێت وە گریمان ئەگەر کوفریشیان هەبوبێت هەڵەو کوفریان لە شتی دیکەدا بوە و لە بابەتی حکم بغیر ما انزل الله دا حەقەکەیان گوتوە (هەم قولەکەی إبن عباسیان نقل کردوە هەمیش لە تشریعیشدا بە کوفریان زانیوە)، باشە بۆچی ئەو زانایانەی دوای خۆی بەوانەشی کە هەڵەیان هەبوە ئەوانەشی کە "کوفریان هەبوە" کەسێکیان هەڵنەستا بڵێت کاکە إبن عبدالبر کەسێکی درۆزنە و بوهتانی بۆ ئیمام إسحاق کردووە؟ بۆچی کەسیان نەیانگوت بێ سەنەد قسەی إبن عبدالبر وەرناگیرێت بگرە هەمان ئەو ئەثەرەی کە إبن عبدالبر نقلی دەکات بەهەمان نص و دەقەوە نقل دەکەن.

بۆ نمونە:- إبن تيمية لە صارم المسلول (٢/١٥) دا هەمان ئەو قولەی اسحاق بن راهويه نقل دەکات تەنانەت بەبێ نقل کردنی سەنەدەکی ئیمام إبن عبدالبریش بەم جۆرە نقلی دەکات:

"قال إسحاق بن راهويه: أجمع المسلمون على أن من سب الله، أو سب رسوله صلى الله عليه وسلم أو دفع شيئا مما أنزل الله عز وجل، أو قتل نبيا من أنبياء الله أنه كافر بذلك، وإن كان مقرا بكل ما أنزل الله".

واتە: ئیمام ئیسحاق بن راهويه رحمه الله دەڵێت: موسوڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی کە جنێوێك بە الله و رسولەکەی صلى الله عليه وسلم بدات، **یان شتێك لەوەی الله دایبەزاندووە دوور بخاتەوە**، یان پێغەمبەرێك لە پێغبەرانی الله بکوژێت ئەوە کافرە سەرەڕای ئەوەی دان بنێت بە ڕاستی هەموو ئەوەی الله دایبەزاندوە.

صارم المسلول (٢/١٥)

ئاخر ناکرێت ئەم هەموو زانا و علامانە نەیانزابینێت و لەبیریان چوبێت کە إبن عبدالبر درۆزن و کذابە قسە بۆ ئیمام إسحاق هەڵدەبەستێت، وە ناکرێت ئەو هەموو زانایانەی دوای خۆی بەدرۆیان نەخستبێتەوە، وە ناکرێت دوای خۆیشی هەمان ئەثەر نەقڵ بکرێت و گریمان ئەوەشی نقلی دەکات گومڕایەك بێت، جەهمیەك بێت ئایا ئەوەی لێ دەوەشێتەوە درۆ بکات ئەویش؟ ئەم هەموو زانایایە جەهمی و گومڕا بوون سەرەڕای ئەمەش درۆزن بوون؟ کەسیان جورئەتی ئەوەیان نەبوو إبن عبدالبر بە درۆ بخەنەوە؟ بەڵام پاش 1100 ساڵ کەسێك بەناوی بەدر خورماڵیەوە بە خەبەر بێتەوە و ئومەتی ئیسلامی لە درۆیەکی زەبەلاحی گەورەی هەڵبەستراوی شاراوە بە دەمی ئیمامی اسحاق بن راهویەوە ئاگادار بکاتەوە وئومەت لەم بەڵاو موسیبەتە گەورەیە نەجات بدات، ئیتر گوایە گەورەترین کێشە و زامی ئومەت ئەمەیە، بەسەر ئەو هەموو زانایانەی پاش خۆی إبن عبدالبر بە درۆ بخاتەوە، جا چ بە درۆ خستنەوەیەك تەنانەت کاتێ دەقە ئەسڵیەکەشی دەهێنێت کە إبن عبدالبر لە إسحاق بن راهویەوە نقلی دەکات و خیانەتی تێدا دەکات، یانی چەواشەکاری و گەمژەیەتی و گێلایەتیش تا ئەو حەدە کە وابزانێت کە ئەو چەواشانە دەکات کەسێك نیە پێی بڵێت ئەی خبیثی درۆزن چەواشە و خیانەت مەکە، جا ئەمەتان بۆیە پێ نیشان دەدەم تاوەکو بۆتان بسەلمێنم کە ئەمانە بە بەرچاوی خۆتانەوە خیانەت و درۆ دەکەن ئاخۆ لە شتانێك کە خەڵك تێیدا عیلمی نەبێت چ خیانەتهاییێك لەم دینە پاکە بکەن، خیانەتەکەشی ئەوەیەکە دەقە ئەسڵیەکەی ئیمام إبن عبدالبر نقل دەکات وشەی (دفع) بە (ڕەددانەوە) تەرجومەی کوردی دەکات نەوەك بە (دوورخستنەوە) ئیتر گوایە خەڵکینە ئێوە گێلن و چاوتان نیە ببینن، ئەمە بە گێل زانینی خەڵك نەبێت چی بە گێل زانینە؟

## خیانەتەکەی بەدر

لەلاپەڕە 8ـی نامیلکەکەیدا دەڵێت:

"ئەمەش وتەکەی اسحاق ـە رحمه الله: وقد أجمع العلماء المسلمون على أن من سب الله، أو سب رسوله صلى الله عليه وسلم أو دفع شيئا مما أنزل الله، أو قتل نبيا من أنبياء الله، وهو مع ذلك مقرا ما أنزل الله أنه كافر.

التمهيد لابن عبدالبر(226/4)

واتای قسەکەی إسحاق رحمه الله : زانایان کۆدەگن لەسەر ئەوەی هەرکەس جنێو بە الله عزوجل بدات یان جنێو بە پێغەمبەر صلى الله عليەوسلم بدات یان شتێك **ڕەدد بکاتەوە** (ئەمەیە خیانەتەکەی بەدر) کە الله دایبەزاندووە یان پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی الله بکوژێت وە ئەولەگەڵ ئەوەش دانبنێت بەوەی لە الله دایبەزاندووە ئەووە کافرە". قسەکانی بەدر تەواو

وشەی (دفع)ی بە (ڕەددانەوە) تەفسیر کردوە لە کاتێکدا لە هیچ قاموسێکدا لە هیچ زەمەنێکدا وشەی (دفع) لە قسەکەی ئیمام إسحاق بەمانای (ڕەددانەوە و جحد) نەهاتووە، یان هەر پێویست ناکات زۆر لە قاموس ورد ببینەوە سەیرێکی کوردیەکەی یان تفسیرەکەی إبن عبدالبر بکەین دەزانین کە بەدر خیانەتی لێ کردوە.

جا دەپرسم تا ئێستا بینیوتانە کەسێك شتێك کە الله دایبەزاندووە ڕەت بکاتەوە لەگەڵ ئەوەش ئیقراری پێ بکات؟ شتی واتان دیوە کەسێك هەم الله بەدرۆ بخاتەوە هەم بە ڕاستیشی بزانێت؟ ئێ قولەکەی إسحاق بن راهویە وا دەڵێت (ئەگەر شتێکی لابرد پێی کافرە کە ئەگەر ئیقراریش بکات بە هەموو ئەوەی الله دایبەزاندوە) بەڵام تەرجومەکەی لای بەدر بەم جۆرە نیە، بەڵکو بەم جۆرەیە: (ئەگەر شتێکی الله ڕەددبکاتەوە بەڵام ئیقراری پێ بکات هەر کافرە)، سبحان الله، لا حول ولا قوة الا بالله، ئەمە عەرەبیەکەی تەواوە و هیچ کێشەی نیە بەڵام خیانەت دەکات لە قسەکان، وەتاکە ئامانجیشی لەم خیانەتە ئەوەیە

کە بڵێت: (هێشتا ئەو دەلیلەی کە ئێوە دەیهێننەوە، هەر مەبەستی لە ڕەددانەوە و جحد و ئینکارە نەك تەرك كردنی تەواوەتی شەرعی الله و حوکم نەکردن پێی لە دەستووردا)

پێش ئەوەی بچینە سەر مانای وشەی (دفع)، با سەیرێکی چەند معجمێك بکەین بزانین مانای وشەی (دفع) دوور خستنەوە و لابردنە یان ڕەددانەوە و جحد و قبوڵنەکردن و بەدرۆ خستنەوەیە.

i. معجم تعريف والبيان

دفع الشيء: تنحيته، إزالته بقوة.

واتە: **سڕینەوەی، لابردنی بە هێزەوە** .

الله تعالى دەفەرمێت: (ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لفسدت الارض) ﴿البقرة 251﴾

واتە: ئەگەر الله خەڵکی **لەناو بردایە** هەندێکیان بە هەندێکی تریان ئەوە زەوی پڕ دەبوو لە خراپە و تاوان.

ii. معجم (اللسان العرب)ی إبن منظور

الدفع: الإزالة بقوة

واتە: **لابردنی بە هێزەوە**.

## ئایا إجماعی زانایان لەسەر حکم بغیر ما انزل الله چۆنە؟

## ئایا کە گوتویانە کوفری أصغره مەبەستیان لە یاسادانان بوە؟

## ئایا دەلیل و بەڵگەمان چیە لە زانایانەوە کە یاسادانان کوفری أکبره بەبێ ئەوەی پەیوەست بێت بە اعتقادەوە؟

پێش ئەوەی بچینە سەر بابەتەکە حەزم کرد چەند روونکردنەوەیەك بدەم لەسەر ئەم بابەتە بەگرنگم زانی ئاماژەی پێ بدەم، ئەویش ئەوەیە هەندێکجار هەندێك لە برایان دەپرسن بۆچی کاتێکی زۆر ئەم بابەتانەی حوکم و تحاکم تەرخان دەکەیت؟

منیش لە وەڵامدا بۆ ئەو برایانە پێیان دەڵێم بەراستی لەم زەمانەدا گەورەترین کێشەی ئێمە دووربونمانە لە قورئان و سونەت وە پاشان تێگەشتنی قورئان و سونەت بە فەهمی إجماعی سلف، جا کە دوورین لە علم زۆرجار گورگەکان دەمانخەنە ناو تەڵەوە و بە شوبهە و پرسیار و گومان بابەبەتەکانمان لێ دەشوێنن، یەکێك لەو بابەتانەشی کە زۆربەی خەڵکی ئەم سەردەمە کە إنتسابیان هەیە بۆ ئیسلام دژی ئەهلی حەق و طائفەی منصورة قسەی لەسەر دەکەن بابەتی حکم و تحاکمە، چ لە مەدخەلیەکەوە بیگرە تا دەگاتە ئیخوانیەك، جا داستاییەکانیش هەروەکو ئەوان بە ناراستەوخۆ خزمەت بە کوفری جیهانی هاوپەیمانی خاچپەرستی دەکەن دژ بە ئەهلی حەق دەکەن، بەوەی کە هێرش دەکەنە سەریان و بە خەوارج ناویان دەبەن بۆیە بە ئەرکی خۆمم زانی وەکو فەرزێکی کیفایە هەستم بە فێربوونی ئەم بابەتە و ڕەد دانەوەیەکی زۆر توندی داستانیە گومڕاکان، جا لە الله داواکارم بمکاتە هۆکارێك بۆ وەڵامدانەوە و ڕەتکردنەوەی هەر شوبهە و گومانێك کە لە دڵی هەر ئینسانێکی موحددا دروست دەکرێت .

بەڵام لەسەر بابەتی إجماعی زانایان لە بابەتی (حكم بغير ما انزل الله)، إجماعی سلف هەیە کە ئەگەر حاکم حوکمێك نەکات بەوەی الله دایبەزاندوە بە مەرجێك جحد و إنکاری و إستحلالی قلبی تێدا نەبێت پێی کافر نابێتەوە وە خەوارج ظاهری ئایەتی ومن لم يحكم بما انزل الله بەکار دەهێنن بۆ تکفیر کردنی ئەو وەلی ئەمرانەی کە معصیەتی الله دەکەن یان حوکمێك ناکەن بەوەی الله دایبەزاندوە (لە خوارەوە ڕوونیدەکەینەوە چ جۆرە حوکم نەکردنێك کوفری أکبرە و کامیان کوفری أصغر)

ئیمامی أبوبكر جصاص دەڵێت:-

"وقد تأولت الخوارج وهذه الآية، على تكفير من ترك الحكم بما أنزل الله من غير جحود، واكفر بذلك كل من عصى الله بكبيرة او صغيرة".

واتە: خەوارج ئەم ئایەتە (ئایەتی حوکم) یان بەکار دەهێنا بۆ تکفیر کردنی ئەو کەسەی کە واز دەهێنێت لە حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندوە بەبێ ئەوەی ئینکاری بکات، وە هەر بەمەش ئەو کەسانەیان تکفیر کردوە کە تاوانێکی کبیرە یان صغیرە ئەنجام دەدەن.

إبن تيميه لە منهاج السنة دەڵێت:-

"وهذه الآية مما يحتج بها الخوارج أنا تكفير ولاة الأمر الذين لا يحكمون بما أنزل الله، هم يزعمون أن اعتقادهم هو حكم الله".

واتە: خەوارج ئەم ئایەتە(فلا وربك) بەکاردەهێنن بۆ تکفیری ئەو وەلی ئەمرە(موسوڵمانانەی) کە حوکم ناکەن بەوەی الله دایبەزاندوە، وەپاشان وا بیر دەکەنەوە کە ئەم بیروباوەڕەیان(خەوارج) حوکمی الله یە.

إبن القيم دەڵێت:-

"فإنه إن اعتقد وجوب الحكم بما أنزل الله في هذه **الواقعة**، وعدل عنه عصيانا، مع اعترافه بأنه مستحق للعقوبة، فهذا كفر أصغر".

واتە: جا ئەگەر بیروباوەری وابوو کە حوکم بەوەی الله دایبەزاندوە **واجبە لەم قەزیەیەدا** (دیقەت بدەن حوکم نەکردنەکە مەبەستی لە حاڵەتی دیاریکراوە نەوەك تشریع)، وە ئەگەر رووی وەرگێڕا لێی (لە حوکم کردن بە قورئان لەم قەزیەیەدا)، بە دانپێدانانی خۆی کە شایەنی عقوبەیە، ئەمە لێرەدا کوفری بچوکە.

الشنقیطی دەڵێت:-

"اما من حكم بغير حكم الله، وهو عالم أنه مرتكب ذنبا، فاعل قبيحا وإنما حمله على ذلك الهواء، فهو من سائر العصاة المسلمين".

واتە: بەڵام ئەوەی حکم بە غەیری حوکمی الله دەکات، وە دەشزانێت کە تاوانی کردوە، کارێکی ناشرینی کردوە وە هەواو ئارەزو وای لێکردوە ئەم کارە بکات، ئەوا ئەمە وەکو تاوانبارە موسوڵمانەکانی دیکەیە.

جا وەڵامی پرسیاری یەکەم، بەڵێ اجماعی زانایان هەیە کە ئەوەی حوکمێك نەکات بەوەی الله دایبەزاندوە پێی کافر نابێتەوە ئەگەر خۆیبەتاوانبار زانی و جحد و إنکاری نەکرد و نەیدایە پاڵ الله بەڵام چ جۆرە حوکم نەکردنێك؟، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەچینە سەر وەڵامی پرسیاری دووەم.

جا زانایان کە گوتویانە کوفری أکبر نیە و حاکمی پێ کافر نابێتەوە مەبەستیان لە تەرکی حوکمی جار جارەکی بوە و مەبەستیان لە تەرکی تەواوەتی حوکم بەوەی الله دایبەزاندوە نیە، واتە مەبەستیان لە تشریع و یاسادانان و دەستور دارشتن نەبوە.

### بەڵگەشمان بۆ ئەمە هەر لە ڕای زانایان (بێجگە لە قەولەکەی إسحاق بن راهويه)

- ئەوە إبن تیمیەیە کە لەسەرەوە (ئەو وەلی ئەمرانەی کە حوکم ناکەن بە قورئان بە موسوڵمان ناوبرد بەڵام بۆ ئەوەی بۆمان ڕوون ببێتەوە مەبەستی کام حوکم نەکردنەیە با سەیرێکی ئەو قەولە بکەین) دەڵێت: " فيجب على المسلمين أن يحكموا الله ورسوله في كل ما شجر بينهم، ومن حكم بحكم ... مما يخالف شرع الله ورسوله، وحكم

الله ورسوله، وهو يعلم ذلك فهو من جنس التتار، الذين يقدمون حكم (الياسق) على حكم الله ورسوله، ومن تعمد ذلك، فقد قدح في عدالته ودينه".

واتە: واجبە لەسەر موسوڵمانان کە الله و رسولەکەی بکەنە دادوەر لەهەموو ئاژاوە و دوبەرەکیەکاندا، **وە هەرکەسێك حوکمی کرد بە حوکمێك..... لە هەرشتێك کە پێچەوانەی شەرعی الله و رسولەکەی بێت، وەبشزانێت بەوە، ئەوە لە ڕەگەزی تەتەرەکانە**(یانی وەکو تەتەرەکان کافرە)، ئەوانەی کە یاسق پێش دەخەن(بۆ حوکم کردن) بەسەر حوکمی الله و رسولەکەیدا، **وە هەر کەس بە ئەنقەست**(بێ جەهل) **ئەم کارە بکات، ئەوە سوکایەتی بە دادپەروەری و دینەکەی کردوە**(کە سوکایەتیش کافر بوونە بە الله تعالی)

مجموع الفتاوی (35/407)

بە ئیزنی الله دەڵیم: إبن تیمیە لە سەرەتای قولەکەیەوە گوتی ئەوەی حوکم بکات پێچەوانەی شەرع یەکسەر لە رەگەزی تەتەرەکانە واتە کافرە، پاشان وەکو ڕوونکردنەوەیەك بۆ تەتەرەکان دەڵێت تەتەرەکان حوکمی خۆیان پێش دەخەن بەسەر حوکمی الله و رسولەکەیدا، کەواتە ئەو پێش خستنە پەیوەستە بە تەتەرەکانەوە نەوەك ئەو کەسەی کە حوکم دەکات بە پێچەوانەی قورئان و سونەت، ئەوەی مجرد حوکم بکات بە پێچەوانەی قورئان و سونەت ئەوە تەنها بەو حوکم کردنەی وەکو تەتەرەکان کافرە بەبێ دانانی مەرجی بە باشتر زانینی حوکمەکەی لە حوکمی الله.

إبن تیمیە لەقسەکەی سەرەوەیدا حکم بغیر ما انزل الله ی بە تاوان ناوبرد نەوەك کوفر وە هێنایە ئاستی تاوانە ئاساییەکانی دیکە، بەڵام لێرە بە کوفری أكبر دەریدەخات کەواتە ئەگەر ئەوەی سەری سەرەوەی مەبەستی پێی حوکم نەکردنی جار جار لە تنفیذدا نەبێت و ئەوەی خوارەوەی مەبەستی لە حوکم نەکردن لە تەشریع و دەستوردا نەبێت، ئاخۆ دەبێ مەبەستی چی دیکە بێت؟

بۆ داستانییە چەواشەکارەکان ئەگەر بڵێن إبن تیمیە خەلەفە و قسەی لێ وەرناگیرێت و گومڕایە و قسەکەی پێچەوانەی إجماعی سلفە، پێیان دەڵێم درۆتان کرد بە الله قەسەم وە لەسەری سەرەوە إبن تیمیە بە هەمان شێوەی سەلەف حکم بغیر ما انزل الله ی بە معصیەت ناوبرد بەڵام کام حکم بغیر ما انزل الله یە؟

جا هەروەکو چۆن إبن تیمیە جیاوازی بینیوە لە حوکم نەکردنی جار جار و حوکم نەکردن لە تشریعدا، ئاواش سلف جیاوازیان بینیوە لە حوکم نەکردنی جار جار و لە حوکم نەکردنی تشریعدا بەڵام بۆیە بە ئاشکرا سلف قسەیان لەسەر تشریع نەکردوە چونکە لە زەمەنی ئەواندا کەسێك هەڵنەستاوە یاسا دابرێژێت پێچەوانەی قورئان و سونەت تاوەکو ئەمانیش بە توندی قسەی لەسەر بکەن ئەمە سەرەرای قسە لەسەر کردنیان ناوە ناوە و لەملاولا و بە ناراستەوخۆ.

ئینجا درۆزنی و منافقی و دوڕووی داستانیەکان لێرەدا ئاشکرا دەبێت کە داستان محمد بە ڕوویەکی زۆر قایمەوە قسە و قولی إبن تیمیەی لەکتێبەکەیدا نقل دەکرد و دەیگوت ئەها شێخەکەتان پێچەوانەی خۆتانە و لەوەدا کە بە زاهیری لەگەل خۆی بوو قسەی وەردەگرت و تەئیدی دەکرد بەلام دلنیام کە ئەمە دەبینن یەکسەر دەست دەکەنە گریان و بەهانە هێنانەوە بۆ گومرا کردنی إبن تیمیە و رەتکردنەوەی قسەکانی، جاداستان زۆر زۆر بە ئاشکراش دژی إبن تیمیە قسەی دەکرد و گومرای دەکرد و قسەی پێ دەگوت و سوکی دەکرد وە نەشماندەزانی داستان بۆچی وا دەکات، کەچی ئەم قەولانەی بینیوە و زانیویەتی إبن تیمیە لەگەل رەئە پوچەکەی خۆی نیە بۆیە ئاوا قسەی پێ دەگوت و سوکی دەکرد بۆ ئەوەی سبەی دوو سبەی هەموو قولەکانی إبن تیمیە دەرکەوتن إبن تیمیە ناشرین بێت لەبەرچاو خەڵکی و قسەی لێ وەرنەگیرێت.

- إبن الحزم دەڵێت: "لا خلاف بين إثنين من المسلمين، أن من حكم بحكم الإنجيل مما لم يأت بالنص عليه وحي في شريعة الإسلام، فإنه كافر مشرك خارج عن الإسلام".

واتە: ڕاجیاوازی نییە لە نێوان دوو موسوڵمان لەسەر ئەو کەسەی کە **حوکم بکات بە حوکمی ئینجیل** کە دەق و وەحی لەسەر نەهاتبێت لە شەریعەتی ئیسلامەوە، **ئەوە کافر و موشریکە و لە دەرەوەی ئیسلامە**.

الإحكام في الأصول الأحكام (5/173)

- إبن تيمية دەڵێت: "نسخ هذه التورات المبدلة، لا يجوز العمل بما فيها، ومن عمل اليوم بشرائعها المبدلة والمنسوخة فهو كافر".

واتە: ئەم تەوراتە گۆڕدراوە نەسخ کراوەتەوە، ئیشکردن بەوەی ناویشی جائیز نییە، **وە ئەمڕۆ هەرکەس ئیش بکات بەو شەرعە گۆڕدراو و نەسخکراوانە ئەوە کافر دەبێت بەوە**.

مجموع الفتاوى (35/200)

- إبن القيم دەڵێت: "وأن من إلتزم ما جائت به التورات والإنجيل ولم يتبع القرآن، فإنه كافر".

واتە: **ئەوەی پابەند ببێت بەوەی کە لە تەورات و ئینجیلدا هاتووە و شوێنی قورئان نەکەوێت، ئەوە کافرە**.

أحكام أهل الذمة (1/533)

بە ئیزنی الله دەڵێم: وەکو پێشتر سەلماندوومانە کە حاکم ئەگەر حوکمێکی نەکرد پێی کافر نابێتەوە بە ئیجماعی زانایانی قەدیم و حەدیث، بەڵام ئەگەر سەیرێکی زاهیری ئەم سێ قەولەی سەرەوە بکەیت کە لەسەر حوکم کردن بە شەرعە نەسخ کراوەکان گوتراوە، ئەوە زاهیرەکەی دژی ئیجماعی زانایان دەردەکەوێت، بەڵام نەخێر لە ناوەڕۆکدا هیچ پێچەوانەی ئیجماعی زانایان نین،

جا ئەگەر ورد ببنەوە لێی باسی ئیلتیزام نەبوون بە حوکمی ئیسلامەوە دەکەن، وەکو ئاشکراشە لەلاتان وشەی ئیلتیزام بە مانای پابەند بوون دێت، پابەند بوونیش بریتیە لە جێبەجێکردنی ئەو شتەی کە پابەندی پێوەی (بە هەمیشەیی)، جا یەکێك کە پابەند بێت بە حوکمی ئینجیلی حەقیقیشەوە کە الله نەسخی کردوەتەوە، ئەوە بە مانای ئەوەیە کە حوکمی ئینجیل بە هەمیشەیی تطبیق کردووە و حوکمی قورئانی بە تەواوەتی وەلاناوە و تەرکی کردووە، کەواتە لەمەوە بۆمان ڕوون دەبتەوە کە ئەم سێ قەولەی سەرێ کە باس لە حوکم کردن بە شرائعی منسوخ دەکەن، پێچەوانەی ئیجماعی زانایان نییە کە حوکم نەکردن بە کوفر نازانن بە موتڵەقی، کەواتە لەمەوە بۆمان ڕوون دەبتەوە کە تەرکی کوللی حوکمی الله و حوکم کردن بە کتابە ئاسمانیەکانی پێشوو جیایە لە حوکم نەکردنی جار جار، وە ئەم پابەند بوونە بە غەیری حوکمی اللەوە کوفرە بەبێ قید و مەرجی إعتقاد، ئاخۆ حوکمی یاسادانان و تشریع پێچەوانەی شەرعی الله چی بێت؟

تێبینی:- هیچ جیاوزیەك نییە لە نێوان حەددەکان و حوکمە شەرعیەکانی دیکە بۆ تطبیق کردن، هەر حاکمێك پابەند بێت بە هەموو ئەوانەی سەرەوە لە دەستووردا بەڵام جار جار زوڵم بکات لە حوکمدا یان تاوان و معصیەت بکات یان جار جار حوکم نەکات لەگەڵ ئەوەشی کە پابەندە بەو حوکمەوە ئەوە کافر نابێت بەمە، بەڵام گەر پشتگوێی خست و وازی لێ هێناو لە حوکم و دەستوور حوکمەکەی اللەی لابرد و گۆڕی بە حوکمێکی دیکە(ئیتر چ حەددە شەرعیەکان بێت یان هەر ئەمرێکی دیکەی الله) ئەگەر خۆیشی بە تاوانبار زانی لەمەدا هەر کافرە و خوێن و ماڵی حەڵالە، جا یەکێك بڵێت قاتل لای ئێمە ناکوژرێتەوە بە هیچ جۆرێك، ئەمە حەدێکی وەلاناوە، و ئیلتیزامی حوکمی الله ی نەکردووە، بەمە کافر دەبێت ئەگەر خۆشی بە تاوانبار بزانێت. وە بە هەمان شێوە ئەگەر یەکێك بڵێت لە وڵاتی ئێمە حیجاب قەدەغەیە سەرەڕای ئەوەی دەزانین کە حیجاب واجبە بەڵام ئێمە ئیلتیزامی ئەم ئەمرەی الله ناکەین و ئەوەشی ئیلتیزامی ئەم ئەمرە بکات ئەوە سزای دەدەین، ئەم وەلانانە سەرەڕای ئەوەی حەدی شەرعی نیە بەڵام بەمەش هەر کافر دەبێت، چوونکە مولتەزیم و پابەند نەبووە بە ئەمرێکی اللەوە،

کەواتە جیاوازی نییە لە نێوان وەلانان و پەککستنی حەدێکی شەرعی و ئەمرێکی دیکەی الله تعالى.

- إبن تيميه دەڵێت: "ومتى ترك العالم ما علمه من الكتاب الله والسنة رسوله، واتبع حكم الحاكم المخالف لحكما لله ورسوله كان مرتدا كافرا يستحق العقوبة في الدنيا والآخرة".

واتە: هەرکاتێك زانایەك وازی لەو زانستە هێنا کە دەیزانی لە قورئان و سونەتی رسول الله صل الله عليه وسلم **وە شوێن حوکمی کاربەدەستێك کەوت پێچەوانەی حوکمی الله و رسولەکەی دەکات، ئەوا** (ئەو زانایە) **مورتەد و کافرە شایستەی سزایە لە دونیا و قیامەتدا**.

مجموع الفتاوى(35/272)

گوتم: ئەو (حكم الحاكمه)ش بەبێ استثنایە هەر حاکمێك حوکمێکی دارشت پێچەوانەی حوکمی الله و رسولەکەی لەو بابەتە دینیانەی کەچەسپێنراون و معلوم من الدين بالضرورەن(مەبەستمان مخالفە لە تطبيقی حوکمدا نیە)، نەك عالم هەر مرۆڤێك علمی هەبێت و اطاعەی ئەو حاکمە بکات ئەوە خوایەکی دیکەی بۆ خۆی هەلبژاردوە بێجگە لە الله، کە حەرام و حەلالی دینێکی دیکەی بۆ داهێناوە.

الله دەفەرمێت: (وإن أطعتموهم إنكم لمشركون) واتە: ئەگەر إطاعەی ئەوانە(موشریکانی مەکە) بکەن ئەوە ئێوە موشریکن (لە حەلالکردنی خواردنی مردارەوەبوو لە کاتێکدا کە نەشیان دەدایە پاڵ الله کەواتە لێرەوە بۆمان بەیان دەبێت کە استحلال کردن تەنها دانە پاڵ الله ناگرێتەوە).

ئەمە ئەگەر کەسێك إطاعەی حاکمێك بکات لە حوکمێکی خیلافی قورئان و سونەت کافر و مورتەد بێت، ئاخۆ حوکمی ئەو حاکمە چیبێت کە یاسا پێچەوانەی قورئان و سونەت دادەڕێژێت؟ داستانییەکان چاوو ژیری مێشکتان بکەنەوە.

جا لەسەرەوە قسەی إبن تیمیەمان نقل کرد لەسەر ئەوەی خەوارج تکفیری وەلی ئەمر دەکەن کە حوکم ناکەن بەوەی الله دایبەزاندووە، کە ئەگەر

قسەکەی سەرەوەی لەگەل ئەم قسەیەی خوارەوەی بە زاهیری لەیەك بدەین دژ بە یەك دەردەکەون، بەڵام نەخێر دژبەیەك نین دەبێت گشتگیر بکرێن و رێکبخرێن، قسەکەی سەرەوەی لەسەر ئەو حاکمانەیە کە لە تنفیذدا جار جارە حوکم ناکەن بەوەی الله، بەڵام ئەوەی خوارێ تکفیری ئەو زانایە دەکات کە واز لە حوکمی الله دەهێنێت بۆ حوکمێکی طاغوت کە پێچەوانەی شەرع دایدەرێژێت، جا چۆن دەبێت ملتزم(زاناکە) بەم یاسایە کافر بێت بەلام ئەو کەسەی کە خەڵکی ملزم دەکات(حاکمەکە کە یاساکە دادەرێژێت) کافر نەبێت؟

- محمد أمين شنقيطي(ئەوەی کە لە سەرەوەدا دەڵێت ئەگەر حاکم حوکم نەکات بە حوکمی الله ئەوە لە تاوانبارانی موسوڵمانانە نەوەك کافران وە ئەو شنقیطیەی کە داستان قسەکانی لە کتێبەکەیدا نقل دەکات با بێت و باقی قولەکانی دیکەشی نقل بکات و راستگۆ بێت لە گەیاندنی قسەکاندا و قسەیەك وەرنگەرێت و قسەیەکی دیکە رەت بکاتەوە) دەڵێت: "والعجب ممن يحكم غير تشريع الله ثم يدعي الإسلام".

واتە: <u>**سەیر لەوەدایە ئەوەی حوکم بە غەیری تشریعی الله بکات و پاشان إدعای ئیسلامەتی بکات**</u>.

اضواء البيان (3/400)

وە دەڵێت: "وبهذه النصوص السماوية التي ذكرنا يظهر غاية الظهور: أن الذين يتبعون القوانين الوضعية التي شرعها الشيطان علىألسنة أوليائه مخالفة لما شرعه الله جل و علا على ألسنة رسله صلى الله عليهم وسلم، أنه لا يشك في كفرهم وشركهم إلا من طمس الله بصيرته وأعماه عن نور الوحي مثلهم".

واتە: بەم دەقە ئاسمانیانە کە باسمان کرد کە ئامانجەکە نیشان دەدات ئەوانەی کە شوێن یاسا دانراوەکانی دەکەون کە شەیتان دایرِشتون لەسەر زمانی دۆستەکانی کە پێچەوانەی شەرعی الله کە لەسەر زمانی رسولەکەین صلى الله عليه وسلم، <u>**کە هیچ گومان نیە لە کوفر و شیرکیان ئیلا مەگەر لای کەسێك کە الله بینایی کوێر کردبێت**</u>(وەکو داستانیەکان) لە ئاستی نوری وەحی.

اضواء البيان (4/83)

وە دەڵێت: "ولما كان التشريع وجميع الأحكام، شرعية كانت أو كونية قدرية، من خصائص الربوبية، كما دلت عليه الآيات المذكورة كان كل من اتبع تشريعا غير تشريع الله قد اتخذ ذلك المشرع ربا وأشركه مع الله".

واتە: وە یاسادانان و هەموو حوکمەکان، ئیتر ئایا شەرعی (بەڕێوەبردنی وڵات) بن یان گەردوونی و قەدەری بن، لە تایبەتمەندێتی اللەن، هەروەکو چۆن ئایەتە باسکراوەکان دەلالەت لەسەر ئەمە دەکەن، **وە هەرکەسێك شوێنی تشریعی غەیری تشریعی الله بکەوێت ئەو یاسادانەرەی وەکو خوایەك گرتوە و کردویەتی بەشەریك لەگەڵ الله**. اضواء البيان (7/169)

وە دەڵێت: "اعلموا أيها الإخوان، أن الإشراك بالله في حكمه والإشراك به في عبادته كلها بمعنى واحد لا فرق بينهما ألبتة فالذي يتبع نظاما غير نظام الله وتشريعا غير تشريع الله أو غير ما شرعه الله وقانونا مخالفا لشرع الله من وضع البشر معرضا عن نور السماء الذي أنزله الله على لسان رسوله... من كان يفعل هذا هو ومن كان يعبد الصنم ويسجد للوثن لا فرق بينهما ألبتة بوجه من الوجوه، فهما واحد، كلاهما مشرك بالله، هذا أشرك به في عبادته، وهذا أشرك به في حكمه، كلاهما سواء".

واتە: بزانن ئەی برایان کە شەریك دانان بۆ الله لە حوکمدا و شەریکدانان بۆ الله لە عیبادەتدا هەردووکی یەك مانان و هیچ فەرقێك نیە لەنێوانیاندا، وە ئەوەی شوێن تشریعێك دەکەوێت بێجگە لە تشریعی الله یان بێجگە لەوەی الله تشریعی کردووە وە یاسایەك پێچەوانەی شەرعی الله لە دانراوەکانی بەشەر پێچەوانەی نوری ئاسمان کە لەسەر زمانی رسولەکەی دایبەزاندوە، **هەر کەسێك ئەمە بکات لەگەڵ هەرکەسێك عیبادەتی بتێك دەکات و سوجدە بۆ بتێك دەبات هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوانیاندا بە دڵنیاییەوە**، هەردوکیان یەك شتن، هەردوکیان موشریکن بە الله، ئەمەیان شەریکی داناوە لە پەرتسشیدا، **ئەوی دیکەیان شەریکی داناوە لە حوکمی دا**، هەردووکیان یەکسانن.

الحاكمية في تفسير أضواء البيان لاپەڕە 52

دەڵێم: قسەکانی شنقیطی بەرادەیەك ئاشکران پێویست ناکات هیچ ڕونکردنەوەی لەوە زیاتر بدەم چونکە زۆر زۆر بە واضحی قسەی لەسەر دەکات، کەواتە ئەو شنقیطیەی کە لەسەرەوە حوکم نەکردن بەوەی الله دایبەزاندووە بە کوفر نەدەزانی و بە تاوانی دەزانی هەمان ئەو شنقیطیەیە کە یاسادانان بە کوفری اکبر دەزانێت، نەوەك کوفری اکبر یاسادانەری بە خوایەك ناساند کە بێجگە لە الله دەپەرسترێت بەبێ ئەوەی شرطی استحلالی قلبی باس بکات.

جا داواکارم لە داستانیەکان چۆن قسەکانی إبن عبدالبر و إبن تیمیە و شنقیطی و إسحاق بن راهویە لە بابەتی کفر دون کفر وەردەگرن با ئەوەندە مێشکیان بکەنەوە لە ڕوەکەی دیکەشەوە قسەکانی ئەو زانا بەڕێزانە لەسەر تەشریع نقل بکەن و قسەکانیان وەرگرن، جا کە قولەکانی کفر دون کوفری ئەو زانایانە دەبینن دەڵێن ئەمە ڕای ئەهلی سونەیە بەڵام کە ئەم قسانەیان دەبینن کە من نقلم کردن یەکسەر دەڵێن: "إبن عبدالبر جهمیە، إسحاق بن راهویە بوختانی بۆ کراوە، إبن تیمیە جهمیە، شنقیطی خەلەفە ئەو گومڕایە درۆزنە".

لە کۆتاییدا داواکارم لە الله تعالی هیدایەتی ئێمەش و ئەوانیش بدات بۆ ڕێگە ڕاستەکەی و چاوکراوەمان بکات لە وەرگرتنی حەقدا و دوورمان بخاتەوە لە هەموو کوفر و شیرك و ڕیایەك.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين، وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه إلى يوم الدين، وسلم تسليما.

